# مامۆستا سەید قوتب

## وەڵامدانەوەی گومانەکان دەربارەی تەکفیرکردنی





ئامادەکردنی
تاریق احمد

# پێشەکی

لەم نامیلکە کورتەی بەردەســتان بەکورتی دەســتمان ناوە ســەر ئەوەبرینانەی عەلمانیەت و کوفر و کۆیلەکانیان کە مەدخەلییەکانن کە برینەکەیان زامدارتر کرووە، کەسێك سەرەتا جاهیل و نەزان بێ و دواتر شارەزایی ئیسلام بێ و سەر راســتانە بانگەوازی بۆ کوفر بە تاغوت و حاکمیەتی بۆ خوای گەورە بکا کە تەنها حوکم بکرێ بەشــەریعەتی ئیســلام ئەم کەســە گیانی ســەلامەت نابێ لەلایەن دوژمنانی ئیسلام بە بوهاتتان و ناشرینکردنی و لەناو بردن و کوشتنی بۆیە ســەید قوتب گەر کاریگەری لەســەر کورسی تاغوتەکان و دەســەلاتدارە زالم و کافرەکان نەبوایە، ئاوا دژایەتی نەئەکراو زیندان نەئەبوو لە ســێدارە نەئەدرا، هەر بۆیە ئەوەی دژایەتی نەکرێ لەســەر عەقیدەکەی وەکو ســۆفیە موشــریکەکان و مەدخەلیە بەناو ســەلەفیی و گروپە گومراکانی تر بە ئاشــکرا بانگەوازی دەکەن بەلام زیانی نیە بۆ کوفر و عەلمانیەت بۆیە ســەلامەتن و توشی گرتن و ئازار و لێدان نابنەوە هەر لەم ڕێگایەوە بزانە عەقیدەیان راست نیە و گومران، بە یەکێک لە پێشــینیانی (ســەلفی ســالح ) ئومەتیان ووت: ئایا توشی بەڵا و چەرمەسەری نابیت لە سەر ڕێگەی گەیشتن بەخوا؟ ووتی: ئەگەر تووشی بەڵا و چەرمەسەری نەهاتبام،گومانم لە ڕێگەکەم دەکرد.

لەم نامیلکە کورتە ئەو گومان و چەواشــەکاریانەمان وەلام داوەتەوە کە دژی سەید قوتب و تەکفیردنیەتی.

ووتەیەکی ســەید دەگوازمەوە بۆتان لە پێش ئیعدام کردنی بە ماوەیەکی کەم ، کاتێک یەکیک لە زابتەکان پێی ســەرســام ئەبێت بە دلخۆشــی سید ڕەحمەتی خوای لێبێت پێش ئیعدام کردنی ( شەهید کردنی ) سەری سوڕدەمینیت لەوەی ســید نە بێزارە ونە دڵتەنگە پرســیاری لێکرد ووتی: تۆ باوەڕت وایە شــەهید ئەکرێی باشــە مانای شــەهیدی چییە لای تۆ ؟ ســید ڕەحمەتی خوای لێبێت وەڵامی دایەوە و ووتی: شــەهید ئەو کەســەیە کە شــهادەت پێش ڕۆح و خوینی

ئەخات واتە دینی اللە تعالی بە نرخترە لەلای لە ژیانی ، وە هەر لەبەر ئەوەیە کە ڕۆح و ژیانی دەبەخشـێت لە پێناو دینی اللە تعالی دا . وە سـید ڕەحمەتی خوای لێبێت کۆمەڵێک هەڵوێسـت و ووتەی هەیە کە گومانی تیدا نییە ئەوەی حەق و ڕاسـتی بزانیـت و بنـاسـێـت دەزانێـت لە دڵێکەوە دەرچووە کە پڕ بووە لە خۆشـەویسـتی اللە تعـالی و پێغەمبەرەکەی صـلی اللە علیـە وسـلم ، وە خۆشـەویسـتی فیداکاری و قـوربانی دان لە پێناو دینەکەیدا داوای لە اللە تعالی دەکەین کە ڕەحممان پێ بکات وە لە ئێمە و ئەویش خۆش ببێت

## بۆچی تەکفیری و دژایەتی مامۆستا سەید قوتب دەکەن

حەقیقەتی دژایەتیکردنی سەید قوتب لەلایەن مەدخەلیەکان لەوانەیە زۆر بن ئەو کەسانەی کە حاڵی سەید قوتب نازانن، یاخود وتەکانی لێك دەرناکەن یاخود ئەوەتا بە موجەڕەد بینینی هەندێك لە وتەکانی ئیتر دەستی لێ بشۆن و خۆی لێ دوور بخەنەوە، دەشبینین گەورەترین دژایەتی لەم بابەتە لەدژی سەید قوتب لەلایەن مەدخەلیەکانەوە دەکرێت، بەڵکو مەدخەلیەکان پشکی شێریان بەرکەوتووە لە وەڕین بەو مامۆستایە و ناشرینکردنی لەپێش چاوی خەڵك، سەبارەت بە مەدخەلییەکان واتە بەناو سەلەفییەکانی ئەمڕۆ، کەناویان لە خۆیان ناوە سەلەفی، خزمەتکاری دەسەڵات و سولتانەکانن بۆ مانەوەی وەلی ئەمری وڵات هەرکەس دژی ئەم دەسەڵاتە بوەستێتەوە و داوای حوکمی الله بکات، لە لایەن ئەم مەدخەلییە بەکرێ گیراوانە دژایەتی دەکرێ بەناوی تەکفیریی و سەگی ناو دۆزەخ ناوزندە دەکرێ تا خەڵکی باوەر بکەن، تەنانەت ئەم چەواشە و دژایەتیە ئەوەندە سەری کێشاوە کە موسڵمانانیش لەنێو خۆیاندا حاڵی سەید قوتب ڕوون نیە لایان هەموویشی بەهۆی ئەو چەواشە و جنێو و قسە پۆخڵانەی مەدخەلیەکان بووە، کە تەنها ڕووکەشی قسەکە نیشانی خەڵك دەدەن بەبێ ئەوەی ڕوونی بکەنەوە کە ئایا سەید قوتب کەی ئەم قسەیەی کردووە و ئایا لە کام کتێبی بووە و ئایا چ ڕای هەیە دەربارەی ئەو کتێبانەی کە پێشتر نووسیویەتی؟ هەموو ئەم شتانەشیان بۆ ئەوەیە تەلبیس بکەن بەسەر خەڵکدا و سەریان لێ بشێوێنن بەهۆی ئەوەی کە سەید قوتب بیروباوەڕی پێچەوانەی ئەوان بووە و بانگەوازی بۆ شتێك کردووە کە مەنهەجی طاغوتەکان و مەدخەلیەکان ناتوانن هەزمی بکەن و پێیان قبوڵ ناکرێت، وەنەبێت ئەم دژایەتیەش تەنها بەرامبەر سەید قوتب بێت، نا، بەڵکو هەر یەکێك کە هەوڵی بۆ ئەم ئیسلامە دابێت و بانگەوازی بۆ کوفر بە طاغوت کردبێت و بانگخوازی شەریعەت و حوکمی الله بووبێت و هانی گەنجان و

ئوممەتی ئیسلامی دابێت بۆ جیهاد و شەڕکردن لەدژی طاغوتان و گێڕانەوەی خیلافەت و حوکمی الله ئیتر مەدخەلیەکان بێ یەك و دوو دەست دەکەن بە بەجێهێنانی ئەرکی خۆیان بە دەستکردن بە جنێودان و قسەکردن و گومان فڕێدان و ناشرینکردن و قسە پێ وتن لە وتار و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و کتێب و ڕۆژنامە و ڕاگەیاندن بە هەموو شێوازێك هەروەکو ئێستاش ئێمە ئەو حاڵە بەچاوی خۆمان دەبینین کە چی دەکەن بەرامبەر بە موسڵمانانێك کە لە ئەهلی تەوحیدن. ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین کە بە هیچ شێوەیەك دژایەتی شێخەکانی خۆیان ناکەن سەرەڕای ئەو هەموو کوفر و بیدعە و زەندەقەیەی کە لەخۆیان کۆیانکردۆتەوە.

کەچی ڕۆژێك نەمانبیست بێن و بڵێن ئەمە کوفرەکانی ڕەبیع مەدخەلی ئەمە هەڵەکانی عبداللطیف ئەمە فلان قسەیەی عەلی حەلەبی یان ئەمە زیللەت و کوفرەکانی رُسْلان یان ....هتد، کە سوێند بە الله ئەگەر ئێمە قسەکانی سەید قوتب پێوانە بکەین بە قسەی ئەو طاغوتانە ئەوا دەبینین سەید نەگەیشتۆتە چارەکێکی ئەو پۆخڵەواتەی ئەوان وتوویانە ڕوونیشی دەکەینەوە کە سەید قوتب بەریئە لەو گومانانەی مەدخەلیەکان و ئەوەی ئەو شێخ پەرستانە باسیان کردووە جگە لە تێنەگەیشتن و حەقد و بوغزی خۆیان نەبێت هیچی تر نیە. پاشان ئێمە لەم زنجیرەیە مەبەستمان تەزکیەکردنی سەید قوتب نیە لە هەڵە چونکە ئەویش مرۆڤ بووە و وەك هەر یەکێکمان هەڵەی هەبووە و ڕەخنەی لێدەگیرێت بەڵام خۆمانیش بێدەنگ ناکەین لەوانەی کە هاتوون وەکو سەگ پێی دەوەڕن و خۆیشیان بێدەنگ کردووە لە شێخەکانیان و ئەوانەی کە دەیانپەرستن.

ئێ سوێندتان دەدەم بە الله ئەوەی سەید قوتب بینیویەتی لە ئازار و سەختی و زیندان و دەربەدەری و وتنی حەق ئایا شێخەکانی ئێوە تۆسقاڵێك لەوەیان بینیوە؟ نەخێر سوێند بە الله، کەسانێك کە پەروەردەی دەستی طاغوتەکان بن

هەر خەریکی پڕکردنی ورگن و هەر بە دڵی ئەوان فەتوا دەدەن و هەر عەرش و کورسی طاغوتەکان بەهێز دەکەن و هیچی تر.

بە ئیزنی الله لەم زنجیرەیەشدا ئێمە ڕوونکردنەوەمان بەو شێوەیە دەڕوات:

- باســکردنی ژیانی ســەید قوتب و ئاســتەکانی ژیانی کە پێیدا تێپەڕیوە و ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە ماوەی ژیانیدا بەسەریداهاتووە.

- جێگیرکردنی تەوبەی ســەید قوتب و تەراجوعکردنی لە کۆمەڵێك کتێب و نوســراوو و بیروباوەڕی پێشــووی، هەروەها وەســیەتی ســەید قوتب دەربارەی نوسراو و کتێبەکانی.

- وەڵامدانەوەی ئەو گومانانەی کە مەدخەلیەکان ســەید قوتبی پێ تەکفیر و تبدیع دەکەن، کە ئەمە بەداخەوە لەنێو موســڵمانانیش بوونی هەیە بەڵام لەڕاستیدا پێویستی بە تەحقیق و ڕوونکردنەوە هەیە.

- خۆهەڵوەشــاندنەوە و تەناقوضــاتی ڕەبیع مەدخەلی و مەدخەلیەکان لە مەســەلەی دژایەتیکردنی ســەید قوتب، وە دەرخســتنی حەقیقەتی ئەم بابەتە.

اللهم ثبتنا على التوحيد اللهم يا مقلب القلوب ثبت قلوبنا على دينك اللهم إن عصيناك فنحن نوحدك لا تضلنا بسبب ذنوبنا..

## ئاستەکانی ژیانی مامۆستا سەید قوتب

ئاســـتەکانی ژیانی ســـەید قوتب، هەروەها باســـکردنی ئەو گۆڕانکاریانەی کە بەســـەریدا هاتووە لەماوەی ژیانی: پێویســـتە بزانرێت کە مرۆڤ قابیلی گۆڕانە و بەژیـانیـدا بە جۆرەهـا تـاقیکردنەوە و تەجرووبەی جیـاجیـادا تێـدەپەڕێـت، وە ئەوەی کە ئێمە لێرەدا باسـی دەکەین وەنەبێت ئەو پیاوە پێشـینی نەبووبێت لەو گۆڕانەیدا و تەنها خۆی بووبێت، نەخێر، بەڵکو ئەمە شـتێکە لەکۆنەوە بوونی هەبووە و پێشـــینانی ئێمەش بەم ئاســـت و گۆڕانکاریانەدا ڕۆیشـــتوون بەڵام عیبرەت بەوەیە کە ئایا لەسـەرچی مردووە و لەسـەر چ بیروباوەڕێك ژیانی کۆتایی هاتووە و بانگەوازی کۆتا عەقیدەی بۆچی بووە؟

بۆیەش لێرەدا ئێمە باسـی ئەو مەسـەلەیە دەکەین کە سـەید قوتب لەسـەری مردووە چونکە مرۆڤ لەدونیا بەوە حوکمی بەســـەردا دەدرێت کە کۆتاجار لە بیروباوەڕی خۆیـدا باوەڕی پێ هەبووە نەوەك چی لە ڕابردوویـدا هەبووە و فڵان کاتە ئەوەی وتووە و ئەمەی کردووە...هتد کە مەدخەلیەکانیش جگە لەم شـــتە شتێکی تریان پێ نیە، کە دەچن لە کتێبە کۆنەکانیدا وتە دەهێنن و دەیکەن بەو عەقیدەیەی کە ســـەید لەســـەری مردووە کەئەننەما خۆیان لەگەڵی ژیاون و دڵنیـان لەوەی کە ئەمە عەقیـدەکەی بووە !.. پاشـــان ئێمە پێویســـت دەکات بزانین ئایا سـەید قوتب سـەرەتا چۆن ژیاوە و پەروەردەی دەسـتی کێ بووە بەڵام لەکۆتاییدا چی بەسەر بیروباوەڕیدا هاتووە:

بە گشتی سەید قوتب ژیانی دابەش دەکرێتە سەر سێ مەرحەلە:

١- سـەرەتای ژیانی سـەید قوتب وەك هەر عەوامێکی ئاسـایی موسـڵمانان دینی لە دایک و باوکی خۆی وەرگرتووە و بە بچووکی قورئانی لەبەرکردووە و شـــوێن دایـك و بـاوك و عـامی خەڵـك کەوتووە بەبێ ئەوەی بیروبـاوەڕێکی دیـاریکراوی هەبێت.

٢- ئاستی دووەمی ژیانی کە تیایدا ناسراوە بە سەید قوتبی ونبوو ونبوو یاخود ونبوونی بیروباوەڕی، کە لەم تەمەنەی ژیانیدا پەروەردەی دەستی عەلمانی و دیموکراسیخوازەکان بوو وەکو عەققاد و تەها حوسەین، وە ئەوکات زانا نەبوو وە خوێندنەوەیەکی ئەوتۆی بۆ ئوسوڵە ئیسلامیەکان نەبوو بەڵکو تەنها ئەدیب و شاعیر و نووسەرێکی عەلمانی بوو، زۆرترین هەڵەی فکری لەو تەمەنەدا کردووە بەڵام ئەوەی گرنگ و بەپێزە ئەوەیە کە تەوبەی لێکردووە و بە یەکجاری لێی لاداوە - هەروەك لەدواتر ڕوونی دەکەینەوە ان شاء الله -، پاشان ئەچێتە ناو حیزبی بەناو ئیخوان و فەترەیەکی ژیانیشی لەگەڵ ئەواندا بەڕێدەکات بەڵام سوپاس بۆ الله دواتر واز لەوانیش دێنێت.

٣- ئاستی سێیەمی ژیانی کە کۆتا ماوەی تەمەنی بووە و تیایدا بە یەکجاری لە بنج و بنەمای خۆیدا گۆڕاوە و هاتۆتە نێو دینی ئیسلام و بانگەوازی بۆ تەوحید و کوفر بە طاغوت کردووە و ئیخوانیەکانی ڕیسواکردووە و گومڕاییەکانی باسکردوون و ڕەدی مەنهەجەکەیانی داوەتەوە بە تەواوی، هەر لەو تەمەنەشدا بەڵا و تاقیکردنەوە ڕووی تێدەکات تاکو لەو ڕێگایەدا شەهید دەبێت - نحسبه کذلك والله حسیبه -.

[بۆ زیاتر بگەڕێوە سەر کتێبی سید قطب من المیلاد إلی الإستشهاد بە دوور و درێژی باسی کردووە و ڕوونی کردۆتەوە] بۆیەش هیچ ئینصاف و دڵسافیەك لەوەدا نیە کە ئێمە بچین قسەکانی سەید قوتب بێنین لە مەرحەلەی دووەمی ژیانی وتوویەتی لەکاتێکدا خۆشمان باش بزانین تەوبەی لێکردووە و گەڕاوەتەوە ئەگەرنا دە برۆن قسەکانی هاوەڵان بێنن پێش موسڵمان بوونیان و بڵێن ئەوەتا وایان وتووە و ئاوایان کردووە؟

یان بڕۆن قسەکانی ئەبو حەسەنی ئەشعەری بێنن بۆمان کە چل ساڵ لەنێو عەقیدەی موعتەزیلە بوو پاشان تەوبەی کردووە و ڕەدی داونەتەوە؟

یان قسەکانی ئەو زانایانە بێنن بۆمان کە پێش ئەوەی لەسەر مەنهەجی ئەهلی سوننە بن قسەی تریان کردووە؟

ئێ یان ئەوەتا واز لەو قسانەی سەید بێنن یان ئەوەتا یەك بە یەکی ئەو شتانەی هاوەڵان و پێشینان بێنن بۆمان پێش تەوبەکردنیان و بڵێن ئەوەتا گومڕاییەکانیان؟!! (والعیاذ بالله)

## تەوبەکردنی سەید قوتب لەو بیروباوەڕەی پێشوو لەسەری بووە

تەوبەکردنی ســـەیـد قوتـب و تَراجُع کردنی لەو کتێـب و نووســـراوانەی کە لەماوەی ئاستی دووەمی ژیانیدا نووسیویەتی: هەموو ئەوانەی کە زانان بە ژیانی سـەید قوتب یان لەگەڵیدا ژیاون کۆدەنگن لەسـەر ئەوەی کە سـەید قوتب بە چەند مەرحەلەیەکی ژیانیدا تێپەڕیوە وەك پێشـتر باسـمان کرد، وە هەر خۆی بـاسـی لە گەڕانەوە و تەوبەکردنی خۆی کردووە و دانی بەوەدا نـاوە کە ئەو شـتانەی پێشـووتر هەیبوون شـتانێکی جاهیلیەت بوون و الله تعالی ڕزگاری کردووە،

لە کتێبی في ظلال القرآن لە کۆتـاییەکانی بەشـی ١٢ دەڵێـت: (نكتفي في هـذه القـائمـة بـالكتب المتداولـة دون الكتب التي نفـدت ، وليس في النيـة إعـادة طبعها للشـعور بأنها أدت دورها في حينها ولم يعد لها إلا الإعتبار التاريخي، وبعضـها مما يحتوي آراء تبيّن للمؤلف خطؤها فعدل عنها، أو اتجاهات جاهلية نجاه الله منها) واتە: لەم ڕێکخسـتنەدا بەوەندە وازدێنین لە ڕیزی ئەو کتێبە یەك لەدوای یەکانەدا بەبێ بەشـداری ئەو کتێبانەی کە لەناوچوون، وە لە نیەتماندا نیە کە دووبارە چاپی بکەینەوە چونکە هەسـت بەوە دەکەین کە ڕۆڵی خۆیان گێڕا لەکاتی خۆیاندا و ئێستا تەنها اعتبارێکی مێژووی ڕابردووی پێوە دەکرێت، وە هەندێکیشیان ڕاو بۆچوونی وا لەخۆدەگرێت کە بۆ نووسەر ڕوون بوویەوە هەڵەیە و لەو هەڵەیە لایدا، یاخود ئەوەتا چەند ئاڕاستەیەکی جاهیلی هەبووە کە الله لێی ڕزگارکردووە) وە ئێمەش ئینکاری لەوە ناکەین کە سـەید قوتب چەندین تۆمەتی بەسـەردا ساخ بۆتەوە بەڵام بە هەمان شێوە گەڕانەوە و تەوبەکردنەکەشی بە ڕوون و ڕەوانی گەیشتووە پێمان،

یوسف القرضاوي لە کتێبی (مذکرات)ـی خۆی دەڵێت: محمد مهدي البدري لە یەکێك لە برا نزیکەکان کە لەگەڵ سـەید قوتب لەزیندان بوو لەسـاڵی ١٩٦٥ بۆی باسـکرد کە مامۆسـتا سـەید قوتب رحمە الله فەرموویەتی: **(ئەوەی کە نوێنەرایەتی بیروباوەڕی من دەکات بریتیە لەو کتێبانەی کۆتاییم (المعالم والظلال..)** وە ئەو کتێبانەش کە دەرکراون لەکاتکێدا لە زیندان بووە ئەما ئەو کتێبانەی کە کۆن بوون ئەو نایانداتە پاڵ بیروباوەڕی خۆی، جا ئەو کەسـەی کە لەگەڵی زیندانی بوو پێی وت: کەوایە تۆ وەکو شـافعی دوو مەزهەبت هەیە: کۆن و نوێ، وە ئەوەش کە ئێسـتا دەسـتی پێوە دەگریت مەنهەجە نوێیەکەتە نەك مەنهەجە کۆنەکەت، سـید قطب رحمە الله وتی: بەڵێ گۆڕام وەك چۆن شـافعی گۆڕا، بەڵام شـافعی لە فروعەکان گۆڕا و من لە ئوسـوڵەکان). ئەمە خودی قسـەکانی سـەید قوتبە دەربارەی خۆی و گۆڕانەکەی. وە لەوانەش کە دان دەنێن بەوەی کە سـەید قوتب تەوبەی کردووە و گەڕاوەتەوە زۆرن هەندێکیان: براکەی سـەید، واتە محمد قوتب، ناصـر الدین ئەلبانی، بەکر ئەبو زەید، عبدالله ابن جبرین، عبدالعزیز آل الشـیخ، بەڵکو توشـی سـەرسـوڕمان دەبیت کاتێك دەبیسـتیت کە ڕەبیع مەدخەلی خۆی دان بەوەدا دەنێت کە گەڕاوەتەوە هەروەك بکر أبو زید لە الخطاب الذهبي باسـی ئەمەی کردووە.

لێرەشـدا من هەندێ لەو وتانەیان دەهێنمەوە کە باس لە گەڕانەوەی سـەید قوتب دەکەن، وە بۆ ئاگاداریشـتان من هیچ کاتێك ئەمانە بە زانا نازانم و ئاگاداریشیان لەسەر دەدەم بەڵکو کۆمەڵێکیان سەرانی گومڕایی بوون، بەڵام مەبەسـتی من لێرەدا قسـەکانیانە دەربارەی سـەید قوتب کە هەندێکیان قسەکانی ئەوانی تر بەهێزتر دەکەن. محمد قوتب برای سەید قوتب لە وەڵامی پرسیارێك کە دەربارەی هەردوو کتێبی العدالة و لماذا أعدموني لێی کرا وتی:

پرسـیارت لێکردم دەبارەی کتێبی " العدالة الاجتماعیة "، من هەواڵت پێدەدەم کە ئەمە یەکەم کتێـب بـوو نـوســـیویەتی ئەمەش دوای ئەوەی کە پێشـــتر گرنگیـدان و ئیهتیمامەکانی لە پێشـــوتردا دەربارەی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی بـوو، ئەم کـتـێـبەش نـوێـنەرایەتـی بـیـروبـاوەڕەکەی نـاکـات دوای ئەوەی کە بیرکردنەوەی فراوان بوو وە بە یارمەتی الله زیاتر پێی چەقی لەسـەر ڕێی ئیسـلام، وە ئەویش وەســـیەتی نەکردووە کە بیـخـوێننەوە بەڵکو ئەو کتێـبـانەی کە وەســـیەتی کردووە بیخوێننەوە پێش وەفـاتکردنی بریتیە لە کتێبی في ظلال القرآن( وە بە تایبەتی ١٢ بەشـــی یەکەم کە پێداچوونەوەی بۆ کردووە و جوان ڕێکی خستووە لەڕووی نزیك کردنەوەش ئەمە کۆتا کتێبی بوو کە نووسـیویەتی، وە پێداگر بوو لەسەر ئەوەی کە بیروباوەڕەکەی کە لەم کتێبەدایە بیگەیەنێت) هەروەهـا کتێبی معـالم في الطريق(مەشــخەڵی ڕێ) کە زۆربەی زۆری لە کتێبی ظلال وەرگیراوە لەگەڵ زیادکردنی هەندێك بەش بۆی، وە کتێبی هذا الدين، وە المسـتقبل لهذا الدين، وە خصـائص التصـور الإسـلامي، وە مقومات التصـور الإســلامي (ئەم کتێبە دوای وەفاتکردنی بڵاوکرایەوە)، وە الإســلام ومشــكلات الحضـارة، ئەما ئەو کتێبانەی کە وەسیەتی کردووە نەخوێندرێنەوە هەموو ئەو کتێبانە بوون کە پێش کتێبی في ظلال القرآن نووسـیویەتی لەنێویشـیاندا کتێبی العدالة الإجتماعية).

هەروەها بكر أبو زيد لە الخطاب الذهبي دەڵێت: سەیرم کرد کە لە نەقڵ کردن لە کتێبەکانی ســـیـد رحمـه الله تعـالی لە چـاپەکانی پێشـــووی وەکو الظلال و العـدالـة الاجتمـاعیـة (ســـەرەڕای زانیـاریـتـان هەروەک لە پەراوێزی لاپەڕە ٢٩ و غەیری ئەویش هەیە کە ئەو کتێبانە چاپی دەســـتکاریکراویان هەیە) جا ئەوەی واجبە ئەوەیە کە بەپێی ئەمانەتی عیلمی بڕۆین و وەربگرین، دەبێت ڕەخنەکان و ســـەرنجەکان بخرێنە ســـەر نووســـینی کۆتا چاپی هەموو کتێبێك، چونکە ئەو دەســـتکاریکردنەی کە تێیدا دەبێت هەموو ئەو نوســـراوەی پێشـــتر نەسـخ

دەکاتەوە(نایهێڵێت)، وە ئەمەش لە ئێوە شاراوە نیە ان شـاء الله بەڵام لەوانەیە هەڵەیەکی داواکار بێت کە ئایا بۆچی ئەم شــتە نازانێت؟؟ هەروەها ئەمەش لە ســەرنج و دیدی ئەهلی عیلم شــاراوە نیە بۆ نمونە کتێبی ڕۆح هی پێشــەوا ابن القیم کاتێك هەندێکیان بینیان و خوێندیانەوە وتیان: لەوانەیە ئەو کتێبەی لە ســەرەتای ژیانی نووســیبێت، جا بەم شــێوەیە بۆ جێگەی تریش، وە کتێبی العدالة الاجتماعیة یەکەم کتێب بوو بە ئیســلامیەکاندا نووســیوویەتی والله المستعان).

وە بۆ زانیاریتان: کاتێك ئەم چاپەی کتێبی الخطاب الذهبي بڵاوکرایەوە ڕەبیع مەدخەلی هەســتا بە ســڕینەوەی ئەم پەراوێزە لەترســی ئەوەی فەزح ببێت و شــەرمەزار بکەوێت، کەســیش ناتوانێت ئینکاری لەم شــتە بکات لەکاتێکدا ڕەبیعی مەدخەلی خۆی بەشداری لەو کتێبەدا هەبووە.

ناصر الدین الالباني کە سەلەفیە مەدخەلییەکان بەشێخی خۆیان ناوی دەبەن لە وتەیەکیدا دەربارەی سـەید قوتب دەڵێت: پیاوێکی نووسـەرە، وە حەماسـەتی هەیە بۆ ئەو ئیسـلامەی کە لێی تێگەیشـتووە، بەڵام سـەرەتا ئەو پیاوە زانا نیە، وە کتێبەکانی (العدالة الاجتماعیة) بریتیە لە نووسـراوەکانی یەکەمی، وە کاتێك ئەم کتێبەی نووسی ئەوکات تەنها ئەدەبزان بوو، وە زانا نەبوو، بەڵام لەڕاستیدا ئەوەیە کە ئەو پیاوە لە زیندان گۆڕانکاری زۆر هات بەســەریدا، وە هەندێك کتێبی نووســی وەك بڵێی بە قەڵەمێکی ســەلەفی نوســراون نەك قەڵەمی ئەو، بەڵام من باوەڕم وایە کە زیندان هەندێك دەروون پەروەردە دەکات، وە هەندێ هەســت بەئاگا دێنێتەوە، جا هەندێ وتەی نووســی یانی تەنها ناونیشــانەکەی بەســە کە دەڵێت: (لا إله إلا الله مەنهەجی ژیانە)، لا إله إلا الله منهج حیاة. وە عبدالعزیز آل الشــیخ لە فەتوایەکیدا کە لە ڕاگەیاندنەکاندا بڵاوکرایەوە وتی: سەبارەت بە هەڵە من ناڵێم کەس لە هەڵە سەلامەتە، بەڵام پێویستە دڵسافی و ئینصــاف و دادگەریمان هەبێت و وتەکانی نەخەینە ســەر زیاتر لەوەی کە

ئەگەر و ئیحتیمالی هەیە، دەربڕینەکان لە ئەگەری خۆیان زیاتر تێناپەڕێنین و گومانی خراپیشی پێنابەین. وە ئەو پیاوەش جیهادی هەیە و دەزانن کە شەهیدکرا و بە شەهیدی کوژراوە رحمە اللە، وە هەندێك کتێبی هەبوو کە هەڵەی تێدابوو بەڵام #لێیان_گەڕایەوە (واتە تراجعی کرد)، چونکە تەفسیری قورئانەکەی دەستکاریکرا وەك لە مەنهەجی پێشووی، وە بێگومان قورئان هەرکەسێك گرنگی پێبدات و بەردەوام بێت لەگەڵی ئەوا لە حاڵێك دەیباتە حاڵێکی تر).

وە هەروەها شێخ أبو عبدالله بن عمر الهاشمي (الموحد الواثق) دەڵێت: شێخ سەید قوتب - رحمە اللە - فەترەیەکی جاهیلیەتی لەژیانیدا هەیە کە تیایدا ئەدیبێکی عەلمانی بوو لەسەردەستی خاچپەرستان پەروەردە بوو وەکو عەقاد و تەها حوسەین و غەیری ئەوانیش ئینجا لەگەڵ خەوانی موسلیمین(بەناو ئیخوانیەکان) بوو، ئینجا فەترەی ئیستیقامە و جێگیربوون لەسەر تەوحید کە کۆتا فەترەی ژیانی بوو تیایدا بانگەوازی کرد بۆ کوفر بە طاغوت و ڕیسواکردنی ئیخوانیەکان و دەرخستنی گومڕاییەکانیان جا لەپێناوی ئەمەشدا توشی بەڵا و تاقیکردنەوە بوو وە بوو بە پێشەنگێکی چاك تا ئەوکاتەی جەمال عبدالناصری دوژمنی اللە بە لەسێدارەدان کوشتی. جا ئێمە بە شەهید حیسابی دەکەین واللە حسیبە، رحمە اللە تعالی، وە بزانە کە ئەو پیاوە بە توندی هێرشی کردۆتە سەر طاغوتەکان و کتێبەکانی ترسناك و خەتەرن بۆ سەر کورسی و عەرشی طاغوتەکان، بۆیەش هەستان بە بەکرێگرتنی نووسەر و قەڵەمەکان بۆ ئەوەی قسەی پێ بڵێن و تانەی لێبدەن و تۆمەتی کوفری بدەنە پاڵ، ئەوەی کە سەیر و سەمەرەیە ئەوەیە کە ئەو کەسانەی بەکرێگیراون بۆ ناشرینکردن و تانەدان لە سەید قوتب هەر ئەوانەن کە ڕاسپێردراون بەرگری لە طاغوتان بکەن و بە موسڵمانیان بزانن، وە بۆ تەکفیرکردنی شێخ سەید قوتب چەندین شت هاوکاریان بووە لەوانەش نووسراوەکانی لەکاتی موڕتەد بوونی، دێن بەڵگە بەو

شـــتانە دێننەوە کە لەو کتێبـانە دێننەوە، وە هەروەهـا نەزانین و جەهلیـان بە ڕەوانبێژی و بەلاغەی زمانی عەرەبی و دێن وتەکان دەخەنە ســـەر مانایەك کە شــێخ ئەو مەبەســتەی نەبووە. وە هەندێ شــتی هەیە کە هەڵەی تێدا کردووە چونکە دیراسە و گەڕانی خۆی کاریگەری لێکردووە لەگەڵ ئەوەی کە استئناس و ئارامی لەگەڵ قســـەی هەندێ زانایانی تەفســـیر و فەرموودە هەبووە وەکو مەسـەلەی تەئویلی سـیفاتەکان، جا نابینین ئەوان بچن تەکفیری نەوەوی بکەن هەروەك چۆن تەکفیری ســەید قـوتب دەکەن ســەرەڕای ئەوەی هەردووکیان لە تەئویلکردنی سـیفاتەکان بەشـدارن.. والله المسـتعان. وە منیش لێرەدا وازم هێنا لە نەقڵکردنی وتەکانی ابن جبرین و غەیری ئەویش لەترســی درێژ بوونەوە لەوە زیاتر، وە ئەوەش کە باسـم کرد بەسـە بۆ چەسـپاندنی گەڕانەوە و تەوبەکردنی بۆ کەسـێك کە دادوەری و ئینصـافی دەوێت، بەڵکو تەنانەت ناوبانگی ئەو شـتە بەســە بۆ چەســپاندنی چ جای نووســینەوە، بەڵام مەدخەلیەکان هەوڵدەدەن مەســـەلەکە تێکبدەن و تێکەڵاوی بکەن. ئەگەر هێشـــتا هەر ڕەتی دەکەنەوە ئەوا ئێمەش داوایـان لێدەکەین کە هەســـتن بە گێڕانەوەی تەوبەی هـاوەڵان و تـابعین بۆمان تەوبە لەدوای تەوبە وە بە بەڵگەوە بۆمان بســـەلمێنن وە نمونەی ئەوانیش لە زانایانی ئەهلی عیلم کە قســـەیان لە مەســـەلەیەك کردبێت یاخود زیاتر بەڵام دواتر تەوبەیان لێکردووە و گەڕاونەتەوە و مەســـەلەکەش ناوبانگی دەرکردووە. والله أعلم.. إن شاء الله لە داهاتوو دەست دەکەین بە وەڵامدانەوەی یەك یەکی ئەو گومانانەی کە سەید قوتبی پێ تەکفیر دەکرێت.

## وەڵامدانەوەی گومانەکان لەسەر سەید قوتب

**گومانی یەکەم:** سـەیـد قوتـب دەڵێـت قورئـان مەخلوقە! ئەمە یەکێکە لە سـەختترین و توندترین ئەو تۆمەتانەی کە مەدخەلیەکان لەدژی سـەید قوتب رحمە الله بەکاری دێنن، وە ئەگەر داوای بەڵگەیان لێبکەیت دەبینینت چەند وتەیەکی بڕدراو و یاخود کەمکراوە یاخود وتەیەکی کورت دێنن بۆ ئەوەی ئەو تۆمەتە بچەسـپێنن وە بە عـادەتی خۆیشـیان واز بهێنن لەو وتە ڕوون و ئاشـکرایانەی کە سـەید رحمە الله بە ئاشـکرا ڕەددی موعتەزیلە دەداتەوە ئەوانەی کە دەڵێن قـورئـان مەخـلوقە، سـەیـد رحمـە الله لە لۆمەکردنی موعتزیلەکان فەرموویەتی: (إنما تابع المعتزلة منطق أرسطو الذهني وتجريدات أفلوطين المهوّمة، ولم يتابعوا المنهج القرآني، وهو المنهج الإسلامي الأصيل، وكذلك فعلوا فيما عُرف في تاريخ الفكر الإسلامي بعنوان (فتنة خلق القرآن) لئلا يكون القرآن قديما فيتعدد القدماء، والبحث على هذا النحو بجملته غريبٌ على الفكر الإسلامي، وعلى المنهج الإسلامي، #فالقرآن_وحي_الله_وكلام_وكفى") واتە: بەڕاستی موعتەزیلەکان شـوێن قسـەی ئەرِسـتۆی عەقڵانی و سـیفەت نەهێشـتنەکانی ئەفلاتون کەوتن، وە شـوێن مەنهەجی قورئان نەکەوتن، کە خۆی ئەو مەنهەجە بریتیە لە مەنهەجی ئیسـلامی بنچینە(اصـیل)، بە هەمان شـێوە ئەو شـتەیان کرد کە لە مێژووی فکری ئیسـلامیدا ناسـراوە بە ناونیشـانی (فیتنەی خەلقی قورئان)، ئەمەش بۆ ئەوەی قورئان نەبێتە شـتێکی قەدیم(کۆن) لە ئەنجامدا قەدیمەکان زۆر بن، گەڕانیش بەم شـێوازە شـتێکی سـەیرە لە مێژووی فکری ئیسـلامیدا، وە لەسـەر مەنهەجی ئیسلامی، چونکە (قورئان وەحی الله ـیە و وتەیە و تەواو). سەرچاوە: مقومات التصور الإسلامي لا ٢٧٨ چاپی دار الشروق.

ئەوەتا ئێمە دەبینین کە سـید قطب رحمە الله نەفی ئەو فکرە دەکات کە دەڵێت قورئان مەخلوقە وە بە ئاشـکرا لۆمەی ئەو فیرقەیە دەکات کە وایان وتووە، جا

کەواتە پێویســـتە لەســـەرمان هەرچی قســـە و کورت و پوختی هەیە لەم بابەتە هەمووی بهێنینەوە ســەر ئەم ڕوونکردنەوەیە(مەگەر ئەوەتا قســـەیەك بێت بە ئاشـــکرا بڵێت قورئان مەخلوقە یاخود شـــتێکی وتبێت غەیری ئەم مانایە هیچ مانای تر هەڵنەگرێت !، کە ئەمەشی نەوتووە و تەحەددای هەموو مەدخەلیەك دەکەم وتەیەکی سەید قوتب بهێنن بۆمان بەو مانایە یان بەو شێوەیە).

وە لە تەفســیری ســورەتی البقرة ( کە یەکێکە لەو بەشــانەی کتێبی الظلال کە خۆی پێـداچوونەوەی بۆ کردووە پێش وەفـاتکردنی) لە تەفســـیری ئـایەتی ٧٥ فەرموویەتی: (فالطبيعة المؤمنة طبيعة مســتقيمة تتحرج من هذا التحريف والالتواء والفريق المشـــار إليه هنا هو أعلم اليهود وأعرفهم بالحقيقة المنزلة عليهم في كتابهم هم الأحباروالربانيون الذين يســـمعون كلام_الله_المنزل على نبيهم موسى في التوراة) واتە: جا سروشتی ئیماندار سروشتێکی تەواو و بێ پێچ و پەنایە، توشــی ناخۆشــی و هەراســانی دەبێت لەو جۆرە تەحریف و گۆڕین و تەفریقە کە لێرەدا ئاماژەمان پێکردووە، جا ئەوان زاناترینی جوولەکەکان بوون بە ڕاســتی و حەقیقەت کە دابەزێنراوەتە ســەریان لە کتێبەکانیان ئەوانیش ئەو ئەحبار و ڕەببانیانەن کە گوێ لە ( وتە دابەزێنراوەکانی الله دەگرن کە لە تەوراتدا دابەزێنراوەتە ســەر پێغەمبەرەکەیان موســا ) اهـ. کەواتە زانیمان ســەید قـوتب نەفی قەول بە خەلقی قورئـان دەکات و ســـیفەتی کەلام بۆ الله تعـالی جێگیر دەکات. جا ئایا جەهمی و ئەشعەریەکان ئەو قسەیە دەکەن؟

ئەگەر بڕۆیـت و یەك بە یەك بە کتێبەکانیـدا بگەڕێیـت بۆ ئەوەی تەنهـا یەك وتەی ڕوون و ئاشـکرا بدۆزیەوە تیایدا سـەید قوتب بڵێت قورئان مەخلوقە ئەوا دەســـتت ناکەوێت بە دەســـتبەتاڵی دەگەڕێیتەوە، بەڵکو ئەوپەڕی شـــتێك کە بیدۆزیەوە ئەوەیە کە لەڕووی ئیعجـاز بـاســـی کردووە و ئەوە شـــتێك بێت کە کردەی الله یە. لەگەڵ ئەوەشـــدا مەدخەلیەکان گوێم لێڕاگرن !، کاتێك ئەم وتـانە نەقڵ کرا بۆ لای ئەلبـانی وەك هەوڵـدانێـك لەلایەن موریـدەکانی ڕەبیع

مەدخەلی بۆ ئەوەی فەتوایەك لە ئەلبانی وەرگرن تاکو ســـەید تۆمەتبار بکەن بەوەی کە وتوویەتی قورئان مەخلوقە ئەلبانی ئەمەی ڕەتکردەوە و وتی ســـەید نەیوتووە قورئان مەخلوقە ئەو قسەیەش هەڵەیەك بووە لێی ڕوویداوە.

بە هەمان شـــێوە بكر أبو زيد لە الخطاب الذهبي دەڵێت: ( پێنجەم: وە لە ناونیشـــانەکانی پێڕســـتەکە (ســـەید قوتب دەڵێت قورئان مەخلوقە، وە کەلامی الله دەستەواژەیەکە دەربارەی وەیست و ئیرادە)، وە منیش کاتێك گەڕامەوە ئەو لاپەڕانەی کە باسـكراون نەمبینی ســەید - رحمه الله تعالى - بە یەك پیتیش ئەم قسـەیە ڕوون و ڕەوان بکات و بڵێت: قورئان مەخلوقە ! باشـە چۆن ئەبێت ئەم هەموو ئاســـانکاریە بکرێت بۆ ئەوەی تۆمەتبار بکرێت بەم شـــتە کوفریانە؟ ئەوپەڕی کە لە وتەکانیـدا بینیم ئەوەیە کە درێژکردنەوەی هەڵســـوکەوت و ئوســـلوبی هەیە، وەك دەڵێت: (بەڵام ئەوان ناتوانن ئەوە بنووســـن - واتە پیتە بڕدراوەکان - وەك ئەم قورئانە، چونکە ئەمە لە کردە(صـنع)ـــی الله یە نەك لە کردەی خەڵـك) ئەمەش دەســـتەواژەیەکە گومانمـان نیە لەوەی کە هەڵەیە، بەڵام ئایا لەڕێی ئەو وتەیە حوکم بدەین بەسەر سەید بەم وتە کوفرییە (بەوەی کە وتبێتی قورئان مەخلوقە)؟ اللهم من هەرگیز ناتوانم بەرگەی ئەم شتە بگرم) ئەمە تەواوی قسەکانی بوو لە کتێبی الخطاب الذهبي.

ئینجـا دوای ئەمە شـــتێکی تر، ئێمە پرســـیارێکتـان لێدەکەین ئەکەر ئێوە بە یەقینەوە دەڵێن وشـەی صنع لە وتەکانی سيد قطب مەبەست پێی خەلق بووە، ئـایـا ئێوە زەمـانەتی ئەوە دەدەن بە ئێمە کە صـــنع تەنها بە مـانـای خەلق و دروستکردن دێت؟

لەکاتێکدا فيروز الآبادي لە قاموس المحيط بەشی ١ لاپەڕە ٧٣٨-٧٣٩ چەندەها مانای بۆ وشـەی صنع باسـکردووە هەروەها ابن منظور لە لسـان العرب بەشی ٨ لاپەڕە ٢٠٨-٢١٣ درێژەیەکی زۆری داوە بە ماناکانی وشـەی صـنع، باشـە ئێوە چوون لەنێو ئەو هەموو مانایە تەنها واتای خەلق دەهێنن بۆمان؟

یان ئەوەتا بە بەڵگەیەکی یەقینی بیسەلمێنن بۆمان کە سەید قوتب مەبەست پێی خەلق بووە با ئێمەش نەوەستین لە تەکفیرکردنی، بەڵکو تەحەددای گەورەترین شێخەکانتان دەکەین ئەمەمان بۆ بهێنن.
وە ئەو شتەش کە بە تەواوی قسەکەتان پوچەڵ دەکاتەوە و پێمان دەڵێن کە سەید قوتب لێرەدا مەبەستی وشەی خەلق بووە کە لە سورەتی ئیخلاص باسی کردووە ئەوا پێتان دەڵێین: سەید خۆی وەسیەتی کردووە ١٢ بەشی یەکەمی تەفسیرەکەی بخوێنرێتەوە و واز لە بەشەکانی تر بهێنرێت، وە سەید ئەوکاتەی خەریکی پێداچوونەوە بوو بۆ کتێبی في ظلال القرآن تەنها بە ١٣ بەش ڕاگەیشت پێش ئەوەی پێداچوونەوەکە تەواو بکات وەفاتی کرد رحمه الله. جا نازانم سوڕانەوەی ئێوە بە دەوری چ شتێکە لەکاتێکدا خۆشتان لەخۆتان تێناگەن.
هذا والله أعلم

**گومانی دووەم:** سەید قوتب تانە لە هاوەڵان دەدات ! مەدخەلیەکان زۆر ئەم گومانە دووبارە دەکەنەوە و یەك لەدوای یەك دەیڵێنەوە لە کۆڕ و مەجلیسەکانیان وە ناوی سەید قوتب ناهێنن مەگەر بەو ناوە نەبێت (جنێودەر بە هاوەڵان) جا سوێند بە الله ئەمە شورەیی و نامەردیەکی گەورەیە و شەرمەزاریە بۆیان، خۆ تەنانەت ئەگەر لەسەر وتە کۆنەکانیشی ڕەخنەی لێ بگیرێت و دادگایی بکرێت خۆ ئەو قسانەی لەبەر ئەوە نەکردووە کە دوژمنایەتی لەگەڵ هاوەڵان هەبووبێت بەڵکو ئەو شتانەی وتووە وەکو ڕەخنە بەهۆی ڕوودانی هەندێك شت لە بەشێکیان کە سەید لەو شتەدا پشتی بە هەندێ ڕیوایەت بەستووە کە لە کتێبەکانی تاریخ ڕیوایەتکراون کە ئەمەش هەڵەیە لەلایەن سەید ڕوویداوە الله لێی خۆشبێت بەڵکو دەبوایە بگەڕێتەوە سەر ڕیوایەتە صەحیحەکان.

وە لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك شێخ محمود شاکر ئامۆژگاری کرد لەسەر ئەو شتە، سەید هیچ عینادی نەنواند و بەردەوام نەبوو لەسەر ئەو شتەی هەروەك مەدخەلیەکان وادەڵێن، بەڵکو کتێبەکانی چاك کرد و هەموو ئەو هەڵە و کەموکوڕیانەی لێ چاك کرد بەڵام پێش ئەوەی پێداچوونەوەکان تەواو بکات وەفاتی کرد و پێڕانەگەیشت هەموو کتێبەکانی تنقیح بکاتەوە. نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ئەو خراپانەی هەموو گۆڕی بە ستایش و مەدحی عەتری وە هەستا بە نووسینی پارچە نووسراوێکی زەبەلاح بەناوی (جیل قرآني فريد) واتە: نەوەی قورئانی تاك. هەر ئەم بەشە بوو کە شێخەکەتان واتە ئەلبانی ستایشی کرد و وتی بە قەڵەمێکی سەلەفی نووسراوە، وە مەدحی کرد بەڵکو هەندێکی لێ نەقڵ کرد لە پێشەکی چاپی یەکەمی کتێبەکەی (مختصر العلو) کە (المكتب الاسلامي) لە دیمەشق چاپی کرد لەساڵی ١٩٧٢، ئەلبانی لەوێدا دەڵێت:

(وە بەڕاستی هەندێك لە بانگخوازە ئیسلامیەکان بەئاگاهاتنەوە لەم شتە... ئا ئەوەتا مامۆستا سەید قوتب - رحمه الله تعالى - کە دەربارەی نەوەیەکی قورئانی تاك(جيل قرآني فريد) نووسیویەتی). وە دەڵێت: ئەو پیاوە کتێبی " العدالة الاجتماعية "ی هەیە بەڵام هیچ بایەخێکی نیە، بەڵام کتێبی معالم في الطريق لێکۆڵینەوەی زانستی باشی تێدایە.

سەرچاوە [شريط رقم : ( ٧٨٤ ) من " سلسلة الهدى والنور "]

وە لە هەمان سەرچاوە دەڵێت: (من بڕوام وایە کە ئەو پیاوە زانا نەبووە، بەڵام چەندین وتەی هەیە لە حەقیقەتدا - بە تایبەت لە زیندان - وەك ئەوەی ئیلهام بێت) وە ابن قعود ستایشی ئەو کتێبەی کرد و توڕە بوو کاتێك گوێی لە یەکێك لە بێعەقڵەکان بوو ئەو کتێبەی سەید قوتبی بە نەفرەتلێکراو(ملعون) ناودەبرد وە دواتریش باسی (جيل قرآني فريد)ی کرد بۆی.

وە منیش لێرەدا بەشێك لە نووسینی ئەو کتێبە دێنم بۆتان تاکو بزانن خۆشەویستی و سەرسوڕمانی سەید بۆ هاوەڵان بە چ ڕادەیەك بووە.

لە کتێبی معالم في الطريق دەڵێت: (لقد خرَّجت هذه الدعوة جيلاً من الناس - جيل الصــحابة رضــوان الله عليهم - جيلاً مميزًا في تاريخ الإســلام كله وفي تاريخ البشــرية جميعه . ثم لم تعد تخرج هذا الطراز مرة أخرى .. نعم وُجد أفراد من ذلك الطراز على مدار التاريخ . ولكن لم يحدث قط أن تجمَّع مثل ذلك العدد الضخم ، في مكان واحد ، كما وقع في الفترة الأولى من حياة هذه الدعوة). واتە: بەڕاســتی ئەم بانگەوازە نەوەیەکی هێنایە کایەوە لەنێو خەڵك - نەوەی هـاوەڵان الله لێیـان ڕازی بێـت - نەوەیەکی نـایـاب و تـایبەتمەنـد بوون لەمێژووی ئیسلام هەمووی، وە لە مێژوویی مرۆڤایەتی بە تەواوی، هەروەها وای لێهاتووە کە جارێکی تر نەوەی لەم جۆرە دەرناکەوێتەوە، بەڵێ کەسـانی تاك تاك لەم شـێوازە لە مێژوودا بوونیان هەبووە، بەڵام هەرگیز ڕوونادات کە ژمارەیەکی لەم جۆرە زەبەلاحە کۆبکاتەوە لە یەك شوێن،
هەروەك لە فەترەی یەکەمی ژیانی ئەم بانگەوازە ئەم شتە ڕوویدا(هاتنە کایەوە) جا من پرســیارتان لێدەکەم و ســوێندتان دەدەم بە الله، ئایا ئەوە قســەی کەســێکە تـانە لە هـاوەڵان بـدات و تەکفیریـان بکـات و ڕێزیـان نەگرێـت؟! وە بەئیزنی الله تـعـالی لە داهـاتـوو وەڵامی هەمـوو ئەو گـومـانـانەش دەدەمەوە سـەبارەت بە تانەدانی سـەید قـوتب لە هاوەڵە بەناوبانگەکان وەک عوسـمان و معـاویە، بعون الله تعـالی. والله أعلم وصــلى الله على نبيـه المكرم ورضــي عن الصحب الميامين ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.

**گومانی سـێیەم:** سـەید قوتب تانە لە خیلافەتی عوسـمان دەدات ! ڕەبیع و موریدەکانی زۆر ئەم قسـەیە دووبارە دەکەنەوە (سـەید قوتب خیلافەتی عوسمان دەخاتە خوارەوە و سقوطی دەکات و تانەی لێدەدات) بۆ نمونە ڕەبیع مەدخەلی ڕەدی سـەید بۆ بەییومی نەقڵ دەکات ئینجا یەك خاڵ دادەنێت لەو شـوێنەی کە باسـی عوسـمان دەکات وە لێدوانی لەسـەر دەدات کە ئایا بۆچی خیلافەتی عوسمان إسقاط دەکات و دەیخاتە خوارەوە؟

جا خۆ ئەگەر سـەرنجی وتەکانی سـەید بدەین دەبینین تەنها باسـی مەسـەلەی ماڵ و سـامان و سـیاسـەتی حوکمی کردووە نەوەك باسـی خودی کەسـایەتی عوسـمان - رضي الله عنه - بکات، بۆ ئەمەش بگەڕێوە پێشـەکی کتێبی (مطاعن سـید قطب في الصـحابة) لە نووسـینی ڕەبیعی مەدخەلی(مەخزەلی). (جا ئەم ڕەخنەیەش هەڵەیە و ئێمەش ڕەتیدەکەینەوە بەڵام یەقینمان هەیە کە تەوبەی لێکردووە و لێی گەڕاوەتەوە) جا سـوێندتان دەدەم بە الله سـەیری ئەم قسـانەی خوارەوە بکەن و بیخوێننەوە، ئینجا لێتان دەپرسـم ئایا ئەمە وتەی کەسـێکە کە خیلافەتی عوسمان بخاتە خوارەوە و إسقاطی بکات؟

سـەید رحمه الله لە کتێبی (معالم في الطريق) لاپەڕە ٧٣ دەڵێت: (دەبینیت ئایا ئەگەر ئەبوبەکر و عومەر و عوسـمان - رضـي الله عنهم - دوژمنایەتی ڕۆم و فـارس لەسـەر دوورگەی عەرەبی لابەرن جـا ئـایا دادەنیشـتن لەوەی کە فراوانخوازی ئیسلامی بگەیەننە لێوارەکانی زەوی؟)

جا ئایا پرسـیار دەکەین لێرەدا، ئایا سـەید قوتب خیلافەتی عەلی دەخاتە خوارەوە چونکە باسـی نەکردووە؟! ئینجا هەندێ وتەی تر نەقڵ دەکەن بۆت کە لە کتێبە کۆنەکانیدا هاتووە وەکو کتێبی العدالة و کتێبی تر و نوسـراوی کەسی و شتی لەم جۆرە ئینجاش واز لە في ظلال القرآن دەهێنن کە کۆتا کتێبی بووە نووسـیویەتی و لەکۆتایی ژیانی وەسـیەتی کردووە بیخوێننەوە و تیایدا جوانترین و بەپێزترین وتەی نووسیوەتەوە لە مەدحی عوسمان - رضي الله عنه .

سەید رحمه الله لە کتێبەکەیدا في ظلال القرآن (٧/ ٦٣) دەڵێت: (وە الزمخشري لە تەفسیری خۆی الکشاف خۆی دیاریدەکات کە ئەو کەسە عوسمانی کوڕی عەففان بووە رضـي الله عنه، وە لەمەشـدا چیرۆکێك باس دەکات، کە هیچ پشتی پێنابەسترێت، وە ئەوەی عوسمان رضي الله عنه بناسێت قبوڵی ناکات، هەروەها ئەگەر سروشت و بەخشش و کۆششە دوور و درێژەکەی لەپێناوی الله دا بزانێت بەبێ وەستان و بەبێ حیساب بە هەمان شێوە) هەروەها دەڵێت: (ئینجا پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) پێداگری نواند لە سەفەرەکەی وە فەرمانی کرد بە ئامادەکاری و خێرایی.

وە کەسانی دەوڵەمەندی تایبەت کرد بە بەخشین و نەفەقە و پێدانی هەڵگر بە موجاهیدان ئەوانەی کە هیچیان نەبوو بۆ سواری، جا پیاوانی دەوڵەمەند هەڵسان بەو شتە و حیسابی پاداشتیان دەکرد لای الله. وە لە پێشەکی بەخششکارەکان و حیسابکەرانی پاداشت عوسمانی کوڕی عەففان بوو - رضي الله عنه - جا هەڵسا بە بەخشینی بەخششێکی گەورە کە هیچ کەسێك وەك ئەو نەیبەخشیوە.

ابن هشام فەرموویەتی: بۆیان باسکردووم ئەوانەی کە متمانەیان پێدەکەم کە عوسمان لە سوپای العسرة لە غەزوەی موبارەکی تەبوك هەزار دیناری بەخشی، پێغەمبەر(صلى الله علیه وسلم) فەرمووی: (یا الله لە عوسمان ڕازیبە چونکە من بێی ڕازی بووم) سەرچاوە[ الظلال ١٧٢٣ ]

هەروەها دەڵێت: (ئینجا جوولەکە درێژەیان دا بە فێڵی خۆیان لەدژی ئیسلام و شوێنکەوتووانی لەوکاتەوە.

ئەوان ئەندامی بنەڕەتی بوون لە نانەوەی فیتنەی گەورە کە تیایدا خەلیفەی ڕاشد عوسمانی کوڕی عەففان رضي اللّه عنه کوژرا.

وە ئەوانیش ســـەری فیتنە بوون لەوەی كە لەنێوان عەلی و معاویە - رضــي اللّٰه عنهم - ڕوویـدا، هەروەهـا ســـەركردایەتی دروســـتكردنی فەرموودە و ســـیرە و ڕیوایەت و تەفسیریان كرد.
هەر ئەوانیش دەســـتپێشــخەر بوون بۆ هەڵمەتی تەتـار لەســـەر بەغـداد و لەناوبردنی خیلافەتی ئیسلامی). سەرچاوە(الظلال ١٦٢٨).
مەدخەلیەكان ئەمەبوو تانە و تەشــەری ســەید قـوتب لە عوسـمان (رضـي اللّٰه عنه). وباللّٰه التوفیق.

**گومانی چوارەم:** ســـەید قـوتب تانە لە معاویەی كوڕی ئەبی ســـوفیان دەدات !
ئەمەش یەكێكە لە گەورەترین ئەو گومـانـانەی كە مەدخەلیەكـان دووبـارەی دەكەنەوە لە مەجلیس و كۆڕ و دانیشـتنەكانیان، بەڵكو كۆمەڵێكیان گەیشـتن بەوەی كە بوهتان بكەن بە سەید بەوەی كە تەكفیری معاویە - رضي اللّٰه عنه - دەكات، خۆ ئەگەر بگەڕێینەوە ســەر ڕەدی ســەید قـوتب رحمه اللّٰه بۆ بەییومی ئەوا دەبینین ڕەخنە لە ســـیاســـەتی حوكم و ماڵ و ســـامان دەگرێت، وە بە خەیاڵیدا نەهاتووە هەروەك ئەوان دەیڵێن تانەی لە هاوەڵان دابێت.
(وەك وتمان و دەیڵێینەوە ئەمە هەڵەیە و ئینكاری لێناكەین بەڵام ئەوەی گرنگە بۆمـان ئەوەیە كە تەوبەی لێكردووە و گەڕاوەتەوە لێی وە دەربـارەی معـاویە كۆمەڵێك وتەی نووســـیوە كە تەنـانەت ڕەبیعی مەدخەلی خۆی بەو شـــێوەیە مەدحی معاویەی نەكردووە، وە مەدخەلیەكان خۆتان باشـــتر دەزانن كە ڕەبیع چۆن ڕەخنە لە معـاویە دەگرێـت و بەوە وەســـفی دەكات كە زانـا نەبووە، كە ئەمەش درۆ و بوهتانە بۆ معاویەی كردووە و ئەوەندەمان بەسە كە عبداللّٰه ــی كوڕی عەبباس رضي اللّٰه عنه شـاهێدی بۆ داوە بەوەی كە زانا و تێگەیشـتووە).
ئێســـتاش من هەندێ لە مەدح و ســـەنا و ســـتایشـــەكانی ســـەید قوتب نەقڵ دەكەم بۆتان كە تیایدا مەدحی معاویە دەكات رضـــي اللّٰه عنه، هەروەها باس لەوە دەكات كە چۆن ئیسلام كاریگەری لە دڵی كردووە.

سەید قوتب رحمه الله دەڵێت: ( زۆربەی کات ئەم بانگەوازە خەڵکی دەجوڵێنێت بەرەو لێبووردەیی و ئاشتی، وە بەستنەوەی دڵەکان بە لێبووردەیی الله و لێخۆشبوونەکەی، چەند دەروونێك کە کۆکردنەوەی ماڵ هیچ سودی پێناگەیەنێت، وە تۆڵەکردنەوەی لەوەی کە لەدەستی چووە یان لەو کەسانەی لەدەستی چووە ئارامی ناکاتەوە، ئایا بۆچی ئەو شتە بگەڕێتەوە بۆ وەلی کوژراو کەسێك کە بکوژ بکوژێتەوە؟ یاخود ئایا ماڵ و سامان چ شوێنی ئەوە دەگرێتەوە کە لەدەستی چووە؟ ئەمە ئەوپەڕی توانایە بۆ هەڵساندنی دادوەری لەسەر زەوی، وە پاراستنی کۆمەڵ(جەماعەت)، بەڵام لە دەرووندا شتێك دەمێنێتەوە کە هیچ شتێك دەستی بەسەردا ناهێنێت مەگەر بەستنەوەی دڵ نەبێت بەو قەرەبووەی کە لەلایەن الله دێت. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە فەرموویەتی: وکیع بۆی باسکردین وتی یونس بۆی گێڕاینەوە لە أبي السفر فەرمووی: پیاوێك لە قورەیش ددانی پیاوێك لە پشتیوانان(ئەنصار)ـی شکاند، معاویەش پشتیوانی پیاوەکەی کرد(ئەنصاریەکە) معاویە وتی: ڕازی دەکەین، ئەنصاریەکەش پێداگری کرد، معاویە فەرمووی: مەسەلەکەت بە هاوەڵەکەتەوەیە! - وە ئەبو دەرداء دانیشتبوو - ئەبو دەرداء فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری الله(صلى الله عليه وسلم) بوو فەرمووی: (هیچ موسڵمانێك نیە کە جەستەی توشی شتێك بێت جا خێری پێبکرێت ئەوا بێگومان الله پلەیەك بەو شتە بەرزی دەکاتەوە، یاخود خراپەیەکی لێ دەسڕێتەوە) ئەنصاریەکەش وتی: بەڕاستی من لێی خۆشبووم. سەرچاوە( الظلال ٨٩٩ – ٩٠٠ )

وە لە مەدحکردنی بۆ معاویە فەرموویەتی: ( بەڕاستی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)ی جێهێشت لە دەروونی موسڵمانان بە کاریگەریەکی بەهێز و سروشتێکی گشتی لەم ناحیەیە، ئەو مایەوە وەکو سروشتێکی ئیسلامی تەنها و نێودەوڵەتی نایاب..،

ڕیوایەتکراوە کە لەنێوان معاویەی کوڕی ئەبی سـوفیان و پادشـای ڕۆم کاتێکی دیاریکراو هەبوو، ئەویش بۆ لای ڕۆیشـت لەکۆتایی کاتەکە، تا ئەوەی کە لێیان نزیك بوویەوە هێرشـی کردنە سـەر ئەوانیش هێرشـیان کرد و هەسـتیشـیان نەدەکرد، جا عمر بن عتبة پێی فەرموو: الله أكبر ئەی معاویە، وەفا نەك غەدر، گوێم لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو: (هەرکەسێك کاتێکی دیاریکراو(ئەجەل)ێك هەبێت لەنێوان ئەو و گەلێکی تر ئەوا نابێت گرێیەکەی بشـکێنێت تا ئەوکاتەی ماوەکەی تەواو دەبێت) معاویەش بە سـوپای خۆی گەڕایەوە.

وە ڕیوایەتەکانیش لە پاراسـتنی پەیمانەکان - هەرچەندەی بەرژەوەندی لە شکاندنیشی دابێت - متواتر و بەناوبانگە. سەرچاوە(الظلال ٢١٩٢ – ٢١٩٣ )

با الله شـاهید بێت بەسـەرمانەوە و پرسـیارتان لێدەکەم، ئایا ئەمە قسـەی کەسێکە کە تەکفیری معاویە بکات؟

ئینجا دوای ئەمەش خۆ کتێبی في ظلال القرآن کۆتایی نووسـراوەکانی بوو، ئەمەش بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە لەو هەڵە و زیللەتانەی کە لە کتێبە کۆنەکانی پێشـتر کردوویەتی گەڕاوەتەوە، هەر ئەمەشـە کە صـلاح الخالدي و غەیری ئەویش دڵنیایان کردۆتەوە ئەوانەی کە شارەزان بە ژیانی سەید قوتب.

لە الله تعالی داواکارم هیدایەتی مەدخەلیەکان بدات و بەرچاویان ڕوون بکاتەوە و واز لە تعصوب و گەورەکردنی شێخەکەیان بێنن. اللهم آمين

**گومانی پێنجەم:** سـەید قوتب تانە لە عەمری کوڕی عاص دەدات ! ئەمەش بە هەمـان شـێوە یەکێکە لەو گومـانـانەی کە مەدخەلیەکـان زۆر دووبـارەی دەکەنەوە ئەوەیە هەڵدەسـتن وتە کۆنەکانی نەقڵ دەکەن و تیایدا تۆمەتباری دەکەن بەوەی کە سـەید تەکفیری معاویە و عەمری کوڕی عـاص دەکات، وە ئێمەش گومانمـان نیە لەوەی کە لەپێشـتردا هەڵەی کردووە بەڵام بە هەمـان شـێوە گومـانیشـمـان نیە لەوەی کە تەوبەی لێکردووە و لێی گەڕاوەتەوە و هەروەها هەموو ئەو هەڵانەی دەرحەق بە صـەحابە و هاوەڵان کردبووی چاکی کردنەوە ئەمەش دوای پەیامی شـێخ محمود شـاکر کە لەسـەر ئەم بابەتە بۆی نارد رحمهما الله [ کە بەداخەوە مەدخەلیە داخ لە دڵەکان تا ئێستاش لاڤی ئەوە لێدەدەن دەڵێن سـەید قوتب قبوڵ نەکرد و چاکی نەکردن بەڵام درۆیان کرد سـوێند بە الله ] وە بە دڵنیاییەوە لە چاپەکانی کۆتایی لە کتێبەکانیدا سـتایشـی عەمری کوڕی عاص دەکات و بە فاتیحی موسـڵمانی میسـڕ ناوی دەبات، منیش جگە لەم وتەیە نەمتوانی هیچ وتەیەکی تری بدۆزمەوە لەو بارەیە،

ئەگەر ئێوەیش دۆزیتانەوە بۆم بنێرن ! سـەید قـوتب رحمه الله لە باسـی عەمری کوڕی عاص لە کتێبی في ظلال القرآن دوای ئەوەی باس لەوە دەکات کە میسـڕ پێشتر زەلیل بوو لەژێردەستی فیرعەونی و ڕۆمانیەکان و بەکۆیلەکرابوون، ئینجا دوای ئەمە دەڵێـت: هیچ شـتێـك لەو زەلیلیە ڕزگاری نەکردن تەنها ئیسـلام نەبێت، ئەو ڕۆژەی کە ئیسـلام بە ئازادیەوە بۆیان هات و لە بەندایەتی مرۆڤ ڕزگاری کردن بۆ بەندایەتی پەروەردگاری مرۆڤ، جا کاتێك عبدالله ی عەمری کوڕی عاص کە فاتیحی میسڕ و سەرکردە موسڵمانەکەی بوو هەڵسا بە لێدانی پشـتی میسـڕیەکی قیبتی بە قامچی، هێشـتا کاریگەری لێدانەکە بەپشـتیەوە دیاربوو قیبتیەکەش بەمە توڕە بوو لە فـاتیحی میسـڕ و حـاکمەکەی، وە یەك مانگ لەسـەر پشـتی وشـترێك سـەفەری کرد بۆ ئەوەی شـکات بباتەوە لاس

عومەری کوڕی خەطاب لەکاتێکدا چەندین ســاڵ ئارامی لەســەر لێدان بە قامچی دەگرت لەسەردەمی ڕۆمانەکان... سەرچاوە ( الظلال ١٣٦٤ )
تێبینی: ئەم چیرۆکە قســەی لەســەرە لەلایەن هەندێك لە ئەهلی عیلم وە من لەڕووی دانپێدانان بە صــەحیح بوونی نەمهێنـاوەتەوە، بەڵکو ئەوەی بۆ من گرنگە لێرەدا شاهیدەکەیە بەوەی کە سەید قوتب ئەمەی لە کتێبەکەی کۆتایی ژیانی نووسـیوە و تیایدا عەمر - رضي الله عنه - بە فاتیح و موسـڵمان و حاکمی میســڕی موســڵمان ناودەبات.. ئەمە تەواوی وەڵامەکانم بوون لەســەر ســەید قوتب و مەسەلەی تانەدان لە هاوەڵان، هذا والله تعالی اعلم.

## [ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی تۆمەتبارکردنی سید قطب رحمه الله له بابەتی صیفەتی العلو]

پێم وابێت ئەوەی چەند مانگێك پێش ئێستا وەڵامدرایەوە دەربارەی زۆرینەی شوبهەکان بەس و کافی بوو بۆ کەسێك کە حەق بوێت بەڵام زنجیرەی شوبوهات تەواو نابێت، پاشان ئەبوایە هەر ئەوکاتیش وەڵامی ئەم گومانە بدرێتەوە کە سید قطب پێی تەکفیر دەکرێت گوایە نەفی سیفەتی بەرز و بڵندی الله (العلو) دەکات بەڵام قدر الله وما شاء فعل. پێشم وابێت ئێستا کاتی خۆیەتی بۆ نەهێشتنی ئەو شوبهەیە و دەرخستنی ڕاستەقینەی ئەو قسانە و ئەو تۆمەتەش. وەڵامیشمان بۆ ئەم گومانە لە دوو ڕووەوە دەبێت: یەکەم: بە تەحەدایەك پێشکەشی مەدخەلیەکان و ئەو کەسانەشی دەکەم کە تەکفیری سەید دەکەن. دووەم: گەڕانێك بەناو قسەکانی سید قطب رحمه الله دەربارەی سیفەتی العلو. هێندەی بزانم دەستکەوتی بەرامبەر لە تەکفیرکردنی سید قطب لەبارەی العلو تەنها ئەم قسانەی بووە کە لە في ظلال القرآن دەربارەی ئایەتی (الرحمن على العرش استوى) فەرموویەتی: **"والاستواء على العرش كناية عن غاية السيطرة والاستعلاء"** واتە: الاستواء لەسەر عەرش کینایەت و جێگرەوەیەکە دەربارەی ئەوپەڕی دەسەڵاتداری و بەرز بوونەوە.

ڕەبیع مەدخەلی لێدوانێك لەسەر ئەم قسانە دەدات دەڵێت: **(إنه معطل لعدد من الصفات ، كالاستواء ، والنزول ، واليد ، ولا يستبعد أنه يجري على هذا المنوال في كل الصفات )** واتە: ئەو (سید قطب) پەکخەی ژمارەیەك سیفاتە، وەکو استواء و النزول و اليد، دووریش نیە کە ئەو بەسەر ئەم ڕێیەدا بڕوات لە تەواوی سیفاتەکان.

ئێســتا بەر لەوەی بێمە ناو بابەتەکە ئەمەوێت ئاگادارکردنەوەیەك بە خوێنەر بدەم: "بینیومانە هەرکەســێك تەکفیری ســید قطبی کردبێت ئەوە ڕێك ئەو قسانەی ڕەبیعی دووبارە کردۆتەوە جا ئاگادار بووبێت یان نا،

بۆیە ئەم خاڵەش لەلای خۆت تۆمار بکە کە یەکەم پێشــین لەم شــتەدا ڕەبیع مەدخەلی ســەلولی و گرووپە مورتەدەکەی خۆیەتی" لەبارەی قســەکانی ڕەبیعی مورتەدیش دەڵێم: ڕەبیع کەســێکی موشــریك و کافرە، ســەرخەری طاغوتە، عەدالەتی ساقطە و قسەی لێ وەرناگیرێت، جیا لەوەش عادەتە ناشرینەکەی لە کەس شــاراوە نیە لە بوهتان کردن و درۆ و قســە هەڵبەســتن بە تایبەت بەرامبەر موجاهیدان و ئەوانەش کە مەترسیان لەسەر طاغوتەکانیان هەیە، هەر بۆیەش هەر موســڵمانێك بە کەمترین شــت هەڕەشــەی لە خواکانی ڕەبیع مەدخەلی(آل سلول) کردبێت ئەوە ڕەبیع خراپتر لە سەگی بەردەرگا پێی وەڕیوە و پارێزگاری لە خوداکانی خۆی کردووە، هەر بۆیەش هیچ گرنگی بە قســەکانی ســەرەوەی نادرێت لەلایەن موســڵمانی ڕاســتگۆ و ڕاســتی ویســت. ئینجا ئاگاداریەکیش لەبارەی قســەکانی ســەیدەوە: " ئێمە ئینکاری ناکەین کە لە قسەکانی سەرەوەدا نەپێکاوە و ئەبوایە لە تەفسیرکردنەکەدا بەسەر ڕێگای سەلەف بڕوات بەڵام بوهتانیشی بۆ ناکەین بڵێین ئەها بەم قسانە نەفی علوی کردووە و نایخەینە سەر قسەی جەهمی و ئەشعەریەکان لەکاتێکدا نە قسەی ئەوانی کردووە و نە عەقیدەکەشــی وەك ئەوانە هەروەك لە داهاتوو ڕوون دەبێتەوە بۆتان" پاشــان دێمە ســەر تەحەددای یەکەمم دەڵێم: لە کوێی قســەکانی ســەرەوە هاتووە کە ســیفەتی العلوی پەکخســتووە و باوەڕی پێ نەبووبێت، هەروەها بۆمان ڕوون بکەنەوە لە کام جێگادا وتوویەتی استواء واتا استیلاء ؟! چاوەڕێم و بۆم بهێنن.

پاشــان ئەوپەڕی زوڵم و خیانەتە تۆ بێیت بڵێیت ســید قطب پێی وایە اســتواء واتە استیلاء و لەخۆڕا قسەیەك بدەیتە پاڵی کە نەیکردووە، (بە تایبەتیش ئەو

کابرایەی کە بە وێنە سێڵفیەکانی خۆی پۆستەکانی دەوڵەمەندتر کردووە). دێمە سەر بەشی دووەم ئەویش ڕوونکردنەوەی عەقیدەی سید قطب دەربارەی سیفەتی العلو،

نمونەیەك لە قسەکانی: لە تەفسیری آية الكرسي فەرموویەتی: **("وهو العلي العظيم" وهذه خاتمة الصفات في الآية تقرر حقيقة ، وتوحي للنفس بهذه الحقيقة وتفرد الله سبحانه #بالعلو وتفرده سبحانه بالعظمة فالتعبير على هذا النحو يتضمن معنى القصر والحصر فلم يقل وهو علي عظيم ليثبت الصفة مجرد إثبات ولكنه قال العلي العظيم ليقصرها عليه سبحانه بلا شريك إنه المتفرد بالعلو المتفرد بالعظمة).** واتە: "ئەو گەورە و بەرز و بڵندە" ئەمە کۆتایی سیفاتەکانە لە ئایەتەکە کە بە حەقیقەت جێگیر بووە، هەروەها سروش بۆ دەروون دێنێت بەم حەقیقەتە و تاك و تەنها بوونی الله بە #بەرز_و_بڵندی (العلو) هەروەها تاك و تەنها بوونی الله بە گەورەیی (العظمة)، جا دەربڕین بەم شێوازە مانای تاك کردنەوە و حەصر کردن لەخۆدەگرێت، نەیفەرمووە ئەو بەرز و بڵندە (علي عظيم بەبێ ئەلیف و لام) بۆ ئەوەی سیفەتەکە بە تەنها و مجرد جێگیر بکات، بەڵکو فەرموویەتی: (العلي العظيم) بۆ ئەوەی تەنها بەسەر خۆیدا تەقسیری بکات بەبێ هیچ هاوەڵ و شەریکێك، ئەو تاك و تەنهایە بە بەرز و بڵندی و تاك و تەنهایە بە گەورەیی" قسەکانی تەواو بوون. هەروەها لە تەفسیری سورەتی الإسراء ٤٢-٤٤ کە باسی عەرشی کردووە فەرموویەتی: **(هنا يوحي بالارتفاع والتسامي على هذه الخلائق التي يدعون أنها آلـهة " مع "الله .وهي تحت عرشه وليست معه ....كل دابة على الأرض وكل سابحة في الماء والهواء ومعها سكان السماء كلها تسبح الله وتتوجه إليه في علاه).** واتە: لێرەدا سروش دێنێت بە بەرز بوونەوە و بڵندی بەسەر ئەم دروستکراوانە کە دەڵێن ئەوان پەرستراون لەگەڵ الله لەکاتێکدا ئەوان لەژێر عەرشن و لەگەڵیدا نین...، هەموو ئاژەڵێکی سەر ڕووی زەوی و هەموو

جوڵاوێك بە ئاو و هەوادا و لەگەڵ ئەوانەش کە لە ئاسمانن هەموویان تەسبیحی الله دەکەن و ڕووی تێدەکەن بەرەو بەرزی_و_بڵندیەکەی) قسەکانی بە پوختی تەواو بوون.

هەروەها لە ظلالەکەیدا و لە تەفسیری سورەتی فاطر ئایەتی دەیەم دەربارەی قەولی الله تعالی: **(إليه يصعد الكلم الطيب والعمل الصالح يرفعه)** واتە: گوفتاری چاك و جوان و بەجێ بۆ لای ئەو زاتە بەرز دەبێەوە، کاروکردەوەی چاکیش گوفتاری شیرین بەرز دەکاتەوە. سەید دەفەرمووێت: **" القول الطيب الذي #يصعد إلى الله في علاه والعمل الصالح الذي يرفعه الله إليه ويكرمه بهذا الارتفاع ومن ثم يكرم صاحبه ويمنحه العزة والاستعلاء"** واتە: گوتەی چاك کە بەرز دەبێتەوە بۆ لای الله لە بەرزی_و_بڵندیەکەی و کردەوەی چاکە کە الله بەرزی دەکاتەوە بۆ لای خۆی و شکۆمەندی دەکات بەم بەرز بوونەوەیە، ئینجا خاوەنەکەی شکۆمەند دەکات و سەربەرزی و شکۆمەندی پێ دەبەخشێت" قسەکانی تەواو بوون رحمه الله تعالی.

جا بە ئینصاف و ڕاستگۆییەوە پێم بڵێن ئەمانە قسەی کەسێکن کە نەفی سیفەتی العلو دەکات و باوەڕی بەوە نیە الله بەرز و بڵندە و استوای کردووە؟ وەڵامەکەی بۆ خۆتان.

زۆر خۆم ماندوو ناکەم و بەرامبەرەکەشم زۆر ماندوو ناکەم بەڵام تەنها یەك داواکاریم هەیە بۆ ئەوانەی تەکفیری دەکەن: قسەکانی بەشی دووەمی کۆپی بکە و بڕۆ بیدە بە ئەشعەریەك کە لە کوردستانی خۆشمان ژمارەیان زۆرە و پەیج و ئەکاونتیان هەیە، لێی بپرسە ڕات بەرامبەر بەم قسانە چیە؟ ئەگەر وەك تۆ تەکفیری سەید قوطبی نەکرد ئەوە حەقت بێت، بەڵام تۆ بە عەقیدەکەت بە گومان تەکفیری دەکەیت و پێت وایە نەفی علوی کردووە، ئەشعەریەکەش لەسەر اثبات کردنی سیفەتەکە تەکفیری دەکات کە سید قطب بە ڕوونی و بەبێ خلّت و گومان جێگیری کردووە. والله من وراء القصد

## سەید قوطب و مۆسیقا !

یەکێك لەو شـــتە هەرە هەســـتیار و بەربڵاوانەی کە دەربارەی ســـەید قوطب رحمـە الله وتراوە و خەڵك و خـاکی پێ وروژێنراوە ئەوەیە کە ســـەید قوطب پێی وایە قورئان بریتیە لە ئیقاع و ئاوازی مۆســـیقا و لەســـەر شـــێوازی مۆســـیقا رێکخراوە، بەڵگەکەشـــیان لەســـەر ئەمە قســـەکانی ســـەید قوطبە لەبارەی ســـورەتی النجم. ئێمەش بۆیان زیاد دەکەین و دەڵێین ( مۆســـیقا، مۆســـیقی، موسیقیة و..) هاوشێوەی ئەم وشانە لەتەفسیری ظلالی سەید قوطب زۆرجار باسکراوە، جا ئایا مەبەستی سەید قوطب چیە لەمەدا؟ لەکاتێکدا ئەو خەڵکە چۆن لێی تێگەیشـــتوون، وە ئـایـا حوکمی بەکـارهێنـانی چیە و ئەوان بە چ شێوازێك لێی تێگەیشتوون و ئایا هەڵوێستمان چیە بەرامبەر بە سەید قوطب و بەو قســەیەی کە کردوویەتی و بەوانەش کە بەو قســەیەوە فرپون بۆ ئەوەی تانە بدەن لە سەید قوطب؟

یەکەم : بەدوای ئەصـــڵ و بنچینەی وشـــەی مۆســـیقا گەڕام لەهەندێك لە کتێبەکانی زمانەوانی وەکو (لســـان العرب) و (قـاموس المحیط) بەڵام هیچ باسێکم لەسەری نەدۆزیەوە، لەگەڵ ئەمەشدا ئێمە لەم نوسینەدا خراپترین و نەشیاوترین ئەگەری بۆ دادەنێین ئەمەش وەکو تەحەددایەك بۆ ئەو کەسانەی کە لەم مەقامەدا وەڵامیان دەدرێتەوە، دێین جێگیری دەکەین بەســـەر دەنگ و ئـاوازی ئـامێرە مۆســـیقیەکان وەکو عود و کەمانچە و دەهۆڵ و زورنـا....هتـد، ئەگەر خراپتریش لەمە حیســـابی بکەین ئەوا دەڵێین یەکێکە لەم ئامێرانە، یان ئەگەر ویســـتـت بڵێ هەر هەموویـان دەگرێتەوە.. تـا ئێرە لەگەڵم بن، ئەی چی دوای ئەمە؟

دووەم : با واز لەقسەکەی ئیبن حەزم بهێنین، ئەو خیلاف و ڕاجیاییەی سەردەم وەلا بنێین و ئێمەو ئەوانیش پێمـان وایە هەموو جۆرێك لەجۆرەکانی ئـامێر و ئالەتەکانی مۆسیقا حەرامە لەگەڵ وتنی گۆرانیش لەگەڵی،

وە لەڕووی تەحەدداوە با سـرود و نەشـیدیش حیسـاب بکەین لەگەڵی، لانی کەم بەشـی یەکەم ڕوونەو هەموومان دینی الله عز وجل بەوە دەکەین ئەگەر ڕاشـمان وانەبێت سـرود حەڕامە بەڵام با لێرەدا بەو شـێوەیە فەڕزی بکەین. ئەمانەی سەرەوە لەبەرچاو بگرە و بەردەوامبە لەگەڵم سەبارەت بە ئامێرەکانی ژەنین و عەزف: پێشەوا بوخاری رحمه الله لە ئەبو موسای ئەشعەری رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : **«ليكونن من أمتي أقوام يسـتحلون الحِرَ والحرير والخمر والمعازف»** (البخاري في صحيحه، برقم:[٥٥٩٠] والفتح:٧٠/١٠ كتاب الأشـرب]. واتە: خەڵکانێك لە ئوممەتەکەم پەیدا دەبن کە داوێن و ئاوریشـم حەڵاڵ دەکەن، هەروەها مەشروب و ئامێرەکانی ژەنینیش حەڵاڵ دەکەن. المعازف "لێرەدا جەمعی وشەی معزفةیە و مەبەست پێی ئامێرەکانی ڕابواردن و لەهو کردنە، هەروەها قورطوبی لە لە جەوهەریەوە نەقڵی کردووە کە المعازف بریتیە لەگۆرانی وتن، ئەو شتەش کە لەکتێبی صـیحاحی جەوهەریدا هاتووە ئەوەیە کە بریتیە لە ئامێرەکانی ڕابواردن، هەروەها وتراوە: دەنگی ئامێرەکانە، هەروەها لە کتێبی الحواشـي - الدمياطي هاتووە کە المعازف بریتیە لە دەف و غەیری ئەویش لەئامێرەکانی تر کە لێدەدرێن، هەروەها بە موتڵەقی بە گۆرانی وتن دەوترێت عەزف وە بە هەموو یاریەکیش دەوترێت عەزف" [عون المعبود ١٣-١٨٥] هەروەها الفتح سەرچاوەی پێشوو.. هەروەها لە لسان العرب هاتووە کە "المعازف بریتیە لە الملاهي، ئەگەر تەنها بکرێت و ببێتە المعزف ئەوا بریتیە لەو ئامێرانەی کە لێیان دەدرێت هەروەك ئەهلی یەمەن و خەڵکی غەیری ئەوانیش وادەکەن و ئامێری عود دەکەن بە معزف، هەروەها عەزفی دەف بریتیە لە دەنگەکەی" ٩/٢٤٤ بەپوختی.. ئەما سـەبارەت بە وشـەی ( مِزمار ) من نامەوێ لەبەر نەشـیاوی وشـەکە مانا کوردیەکەی لەداهاتوودا بەکاربهێنم بۆیە لێرەدا ئەوە لەبەر چاو بگرەو لەبیرت نەچێت کە وشـەی مِزمار بەمانای گشـتی واتا ئامێری ( زوڕنا )..

لەکتێبی [لسان العرب ٣٢٧/٤] هاتووە : ( زمر الزمر بالمِزْمارِزَمَرَيَزْمِرُويَزْمُرُ زَمْراً وزَمِيراً وزَمَر اناً غَنَّى في القَصَبِ.... يقال للذي يُغَنِّي الزّامِرُوالزُّمَّارُويقال للقصبة التي يُزْمَرُبها زَمَّارَةٌ...... المِزْمَارُوالزَّمَّارَةُ ما يُزْمَرُفيه الجوهري المِزْمارُواحد المَزامِير.. ) بەپوختی باس لە ئامێری فوو پیاکردنی هەوایی دەکات کە هەروەك باسمان کرد مزمار واتە زوڕنا. لەفەرموودەی أبي بكر رضي الله عنه هاتووە کە دایکمان عائیشە رضي الله عنها ڕیوایەتی کردووە فەرموویەتی: «دخل عليَّ رسول الله صلى الله عليه وسلم وعندي جاريتان تغنيان بغناء بعاث، فاضطجع على الفراش وحوَّل وجهه، فدخل أبو بكر فانتهرني وقال: مزمارة الشيطان عند رسول الله صلى الله عليه وسلم فأقبل عليه رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال: دعهما. فلما غَفَلَ غمزتُهما فخرجتا» (البخاري؛ برقم:[٢٩٠٦]، ومسلم؛ برقم:[٨٩٢]، في صحيحيهما). واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هات بۆلام و منیش دوو جاریە(کەنیزەك)م لابوو گۆرانیان دەوت بەگۆرانیەکانی بوعاث(جەنگی بوعاث)، ئەویش لەسەر جێگەکەیدا پاڵکەوت و ڕووی خۆی وەرگێڕا، لەوکاتەدا ئەبو بەکر هاتە ژوورەوە و لۆمەی کردم و فەرمووی: مزمارەی شەیطان لای رسول الله صلى الله عليه وسلم ؟!! پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم ڕووی تێکرد و فەرمووی: وازیان لێ بێنە، کاتێك بێئاگا بوو(خەوی لێکەوت) ئاماژەیەکم بۆ کردن و دەرچوونە دەرەوە.. ابن حجر لە فتح الباري دەڵێت : قوله «مزمارة الشيطان» بكسر الميم يعني الغناء أو الدف، لأن المزمارة أو المزمار مشتق من الزمير وهو الصوت الذي له الصفير، ويطلق على الصوت الحسن وعلى الغناء، وسميت به الآلة المعروفة التي يزمر بها، وإضافتها إلى الشيطان من جهة أنها تلهي، فقد تشغل القلب عن الذكر" (فتح الباري:[٢ /٥٧٠-٥٧١]). واتە: ( مِزمارة الشيطان ) بە کەسری میم واتە گۆرانی وتن یاخود دەف، چونکە مزمارة یاخود مزمار وەرگیراوە لە الزمير ئەویش بریتیە لەو دەنگەی کە فووی هەیە، هەروەها

بەسەر دەنگی خۆشدا ئیتلاق دەکرێت یان بەسەر گۆرانی، هەروەها ئەو ئامێرە بەناوبانگەشی پێ ناونراوە کە زەمری پێدەکرێت(زوڕنا)، دانەپاڵ شەیطانیش لێرەدا ئەوە دەگەیەنێت کە زوڕنا لەبەشی ئەو ئامێرانەیە لەهو و بێئاگا بوون لەزیکری اللە دروست دەکەن، چونکە دڵ بێئاگا دەکەن لە زیکر.. سێیەم : ئەگەر ئەمە مانای معازف و مزامیر بێت و تەسلیمی بکەین بەحوکمی پێشوو هەموویان، جا ئایا مۆسیقا بێجگە لەم مانایانە بۆ کوێ دەڕوات ؟! بۆیەش لەم کاتەدا دەگەڕێینەوە بۆ حەڕام بوونی مۆسیقا بە موتڵەقی هەر لەگەڵ ئەو شتانەی کە حەڕام کراون لە داوێن و ئاوریشم و مەشرووب و زوڕنا و مۆسیقا و ئامێرەکانی. دوای ئەوە دێین بەرەو بەکارهێنراوی ئامێرەکانی مۆسیقاو معازف و مزامیر لەوانیشدا مۆسیقا بەهەموو شێوازەکانی، دەڵێین: بۆ حەڕام بەکار دەهێنرێت، هەرکەسێکیش بەچاکی بزانێت ئەوا حەڕامی بەچاک زانیوە، هەرکەسێکیش مەدح و ستایشی بکات ئەوا مەدحی حەڕامی کردووە، هەرکەسێکیش ستایشی ئەو کەسە بکات کە بەکاری دێنێت ئەوا ستایشی کەسێکی کردووە کە کەوتۆتە حەڕامەوە، وە هانی داوە لەسەر حەڕام.. جا ئایا ئێوە ناکۆکن لەگەڵم لەسەر ئەم مانایانە؟! وەڵامەکەتان زانراوە پێش ئەوەی بیدەنەوە و هەمووتان دەڵێن ( نەخێر ناکۆك نین)..

چوارەم: ڕەنگە بڵێن ئەم هاتن و چوونە چی بوو بە ئێمەت کرد و چیمان دەستکەوت لەوەی ڕابردوو؟! بەڵام بەپێچەوانەوە لێرەدا نهێنیەکە دەدرکێت و دێینە پێشەوە لێتان، پشت بە اللە دەبەستین و دەڵێین: پێغەمبەر صلی اللە علیه وسلم بە ئەبو موسای ئەشعەری فەرمووە **«يا أبا موسى، لقد أوتيت مزمارا من مزامير آل داود»** ( البخاري؛ في صحيحه، برقم:[٥٠٤٨] ). واتە: ئەی باوکی موسا، بەڕاستی تۆ مِزمارێکت پێدراوە لە مزامیرەکانی ئالی داود (علیه السلام). بۆ زانین : پێشەوا بوخاری ئەم فەرموودەیەی لەبابی (حُسن الصوت بالقراءة للقرآن) هێناوەتەوە. واتە: خۆشدەنگی لە خوێندنەوەی قورئان بیرمان

نەچێت وتمان مزمار بەمانای زورنا دێت بەڵام لەبەر نەشیاوی وشەکە بەکارمان نەهێناوە لەفەرموودەکان. دەپرسم ئایا چۆن لەم فەرموودەیە تێدەگەن؟! وە ئایا لەسەر چ مانایەکی باسکراو بۆ مانای مزمار جێگیری دەکەن لە ئامێرەکانی ڕابواردن و لەهو ؟! وە چ حوکمێکی لەسەردا پەیڕەو دەکەن؟ ئایا باوەڕ بە فەرموودەکە دەکەن یاخود بەدرۆی دەخەنەوە؟ ئەگەر باوەڕی پێدەکەن بە چ زمانێك بۆمان شەرح دەکەن؟ ئەگەر لە ئێمە دەپرسن و خۆتان وەڵاممان نادەنەوە ئەوا دەڵێین : ئێمە لەزمانەوانیدا مانای مەجازی لوغەوی بۆ ئەم شتانە بەکار دێنین و بەو شتە ڕوونی دەکەینەوە و باسی حەقیقەتەکەی دەکەین، زۆریش خۆمان ماندوو ناکەین و ئەمسەر و ئەوسەر ناگەڕێین بەڵکو زانایان بۆیان ڕوون کردووینەتەوە و ئێوەش یان پێیەوە پابەند بن یان ماناو شەرحەکانی خۆتان بهێنن بۆمان

" ابن حجر دەڵێت : مەبەست لە مزمار لەم فەرموودەیە بریتیە لە دەنگخۆشی، بنچینەی مزماریش بریتیە لە ئامێر، ئەم ناوە ئیتڵاق کراوە بەسەر ئەم دەنگە چونکە لەخۆشیەکەدا بە مزامیرەکانی آل داود دەچێت، هەروەها نەوەوی لە شەرحی موسلیم فەرموویەتی، زانایان دەڵێن: مەبەست لە مزمار لێرەدا دەنگێکی خۆشە، ئەسڵی الزمر یش بریتیە لەگۆرانی وتن، آل داود یش هەر بریتیە لەخودی پێغەمبەر داود علیە السلام، وە آل ی فڵان کەس بە خودی کەسەکە دەوترێت، پێغەمبەر داود یش علیە السلام دەنگی زۆر خۆش بووە" [تحفة الأحوذي:١٠ /٢٤١]. هەروەها ابن حجر دەڵێت : " ئەبو داود لە أبو عثمان النهدي تەخریجی کردووە فەرموویەتی: چوومە نێو ماڵی ئەبو موسای ئەشعەری هیچ ( صنج ) و هیچ ( بربط ) و هیچ ( ناي )یەك نەبوو کە دەنگی خۆشتر بێت لەدەنگی ئەو" سەنەدەکەی صەحیحە، لە الحلیەی ئەبو نوعەیم هاتووە، ( الصنج ) بە فەتحی صاد و سکونی نون بریتیە لە ئامێرێکی مس وەکو دوو تەبقە وایە و هەر یەکەیان دەدرێت لەویتریان، هەروەها بربط بریتیە لە

ئامێرێك هاوشــێوەی عودی فارســی، هەروەها نای بریتیە لە مزمار "[فتح الباري:١١٦/٩-١١٧]. کەسیش نەهات بڵێت داود علیه السلام تەپڵێکی هەبوو یان زورنایەکی هەبوو یان ڕەبابەیەکی هەبوو.... حاشـــا وکلا، هەروەها ئەبو موسای ئەشعەریش رحمە الله هیچ کام لەم شتانەی نەبوو، هیچ بەڵگەو دەق و نوســراوێکیش نەهاتووە بڵێت ئەم شــتانە لەشــەرعی پێش خۆمان بووە بەڵام ئێستا حەڕام کراوە. باشــە، ئایا داود علیه السلام ئەم مزمارانەی لەکوێ بوو؟ چۆن پێی درا؟! ئایا لەبەر ئەوە نەبوو چونکە دەنگی بە کتێبی الله خۆش بوو لە خوێندنەوە و تیلاوە کردن کە بریتیە لە زەبووری پیرۆز؟

ئایا زەبوور وتەو کەلامی الله تعالی نەبوو کە بە وەحی ناردبووی بۆ پێغەمبەرە شکۆمەندەکەی ( داود ) علیه السلام؟ ئایا باوەڕمان پێی نەبێت هەروەك چۆن باوەڕمان بە قورئان هێناوە؟ یان ئەو مزمارەی کە دراوە بە ئەبو موســـای ئەشـــعەری رضـــي الله عنە، ئایا لەکوێ پێی دراوەو بەچی پێی دراوە؟ ئایا لەبەر ئەوە نەبوو کە کتابی الله تعالی ی دەخوێنـدەوە کە قورئانی پیرۆزە و کەلامی دابەزێنراوی الله یە؟ بەڵکو بەوە پێی درا کە پیرۆزترین کتێبی الله ی دابەزێنراو بەسـەر چاکترین پێغەمبەری دەخوێندەوە کە قورئان بوو. وە ئایا لەسـەر زمانی کێ ئەم وەسف و ستایشە چەسپاوە بۆ ئەبو موسا؟

ئایا لەســـەر زمانی ڕاســـتگۆترین و باشـــترینی خەڵك و زاناترین و بەتەقواترین کەس نەبوو کە پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم؟ ئایا ئەم شــتەی کە دراوە بە داود علیه السلام دەیخەنە سـەر مانای ئامێرەکانی ڕابواردن و کوتان و لێدان؟ یـان بەدوای مـانـایەکی اســـتعـارة و تەشـــبیـهـ و تەئویـل دەگەڕێن؟ دێن و پێغەمبەران بەریئ دەکەن لەوەی تـاوانیـان ئەنجـام دابێـت و بە مەعصـــوم لەقەڵەمیان دەدەن؟ یـان دەریـان دەهێنن لە ئەنجـامـدانی ئەو شـــتـانەی کە خۆتـان بەحەڕامی دەزانن؟ وە هەمـان پرســـیـاریش دەکەین دەربـارەی ئەو

قســـەیەی کە پێغەمبەر صـــلی الله علیه وســـلم بە ئەبو موســـای ئەشـــعەری فەرموو، وەڵامتان چیە؟!.
جا کە لێرەدا مزمار مەبەســـت پێی ئامێری ژەنین نیەو مانای دەنگخۆشـــی و ئاوازکردن و جوانی دەربڕین و نەرمی دەنگ و نەغمە و هێزی کاریگەر و ڕاکێشەر بێت ســـەرەڕای ئەوەی ئەســـڵەکەی بریتیە لەئامێر وەک ابن حجر وتی، یاخود نەوەوی وتی ئەسڵەکەی بریتیە لەگۆرانی وتن، ئەوا دەڵێین مۆسیقاش لە ئامێر زیاتر هیچی تر نیە بەهەمان شـــێوەی مزمار، بەڵام بەهەمان شـــێوە مانع و ڕێگریشـمان نیە لەوەی کە بڵێین مەبەسـت پێی دەنگخۆشـی و ئاواز چاکی بێت.
ســـەرەڕای ئەوەی مزمار ئامێرێکی مۆســـیقایە بەڵام پێغەمبەر صـــلی الله علیه وســـلم ئیتلاقی کردووە بەســـەر دەنگخۆشـــی و ئاوازچاکی هەروەك لەپێشـــتر باســـمان کرد. بۆیەش لێرەدا ســـەرەڕای ئەوەی لوتی مەدخەلی و بوغزاویەکانیش بەخۆڵدا بچێت دەڵێین: ئەوپەڕی شـــتێك کە ســـەید قوطب مەبەســـتی بێت لەوەی قورئـان وەکو مۆســـیقـا وایە ئەوەیە کە ئەم مـانـایەی لەو فەرموودەیە وەرگرتووە و هـاتووە بەو نـاوە بـاســـی کردووە کە ئەمرۆ بەنـاوبـانگە لەنـاومـانـدا، ئەمەش بۆ ئەوەی بیســـەر لێی تێبگات و بزانێت مەبەســـتی نوســـەر چیە، ئەو وشـــەیەشـی بەکارهێناوە وەك تەعبیر و ئاماژە بۆ چاکی و جوانی قورئان کە الله تعالی دایبەزاندووە بەسـەر چاکترین دروسـتکراوی خۆی، ئەمەش شـتێکی دوور نیە لەو وتانەی کە پێغەمبەر صـــلی الله علیه وســـلم تیایدا باســـی داود و ئەبو موســـای ئەشـــعەری دەکات، حاشـــا ئەگەر پێغەمبەر صـــلی الله علیه وســـلم مەبەســـتێکی خراپ لەوشـــەکانیدا بەکار بهێنێت یاخود وتەیەك یان وشـــەیەك بەکار بێنێت کە جائیز نەبێت و شـــیاو نەبێت بۆ ئەوەی قورئانی پێ وەســـف بکرێت، هەرکەسێکیش پێی وابێت ئەوا ئەو کەسە کافرەو مولحیدە.

بۆیەش لەوەدا ئێمە گومانی چاك بە سـەید قوطب دەبەین مادەم شـتەکە ڕێگەیەکی چاکی هەیەو کەسیش بۆی نیە گومانی خراپ بە کەسێکی دڵسۆز و خاوەن دین بەرێت لەموسـڵمانان تا ئەوکاتەی کارە خراپەکەی لێ دەبینێت یان بە یەقین بۆی دەچەسـپێت، دەڵێین سـەید قوطب لەمەدا شـوێن پێغەمبەر کەوتووە و باسـی لە خۆشـی و جوانی قورئان کردووە و وەسـفی کردووە و سـوننەتی پێغەمبەرەکەی جێبەجێ کردووە لەکاتێکـدا قەومەکە خۆیان بەستۆتەوە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەچەند سوننەتێکی دیاریکراو و بێئاگان لە دەیان و سـەدان سـوننەتی تر ! کێشـەی زۆرێك لەخەڵکیش ئەوەیە کە هەڵـدەسـتن تێگەیشـتنەکان و دەربڕینەکان پـان دەکەنەوە بێ ئەوەی بیگەڕێننەوە بۆ بنچینەو ئەسـڵی شـەرع و زمانەوانی، لەئەنجامدا ئەوەی لەسـەر بانەکە هەیە دەیڕووخێنێت بەسـەر ناوەڕۆکەکەی بە زوڵم و جەزاف و نادادوەری - لە الله داواکارین سەلامەتمان بکات.

پێنجەم : ئایا هەر لەصەحیحی بوخاری و موسلیم لەفەرموودەی عائیشە رضي الله عنها نەتانخوێندۆتەوە کە فەرموویەتی: «أن الحارث بن هشـام سـأل النبي صلى الله عليه وسلم كيف يأتيك الوحي؟ قال كل ذاك؛ يأتي الملك أحيانًا في مثل صَلصلة الجرس فيفصـم عَنِّي وقد وعيت ما قال؛ وهو أشـده علي، ويتمثل لي الملك أحيانا رجلا فيكلمني فأعي ما يقول» (البخاري؛ برقم [٢]،ومسلم؛ برقم:[٢٣٣٣]، في صحيحيهما) واتە: حارثی کوڕی هیشام پرسیاری کرد لەپێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، ئایا چۆن وەحیت بۆ دێت؟ فەرمووی: هەندێك جار فریشـتەکە دێت هاوشـێوەی دەنگی جەڕەس..تا کۆتایی فەرموودەکە. ئایا قەت بە بیرتاندا نەهاتووە کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم چۆن وەحی پاك و پیرۆزی چواندووە بە دەنگی جەڕەس؟ جەڕەسـیش لەزمانەوانیدا چەندین مانای هەیە وەکو دەنگ، جەڕەسی چۆلەکە...هتد بگەڕێوە بۆ [لسان العرب:٦/٣٥].

بەڵکو پێشـــەوا موســـلیم لە ئەبو هورەیرە رضـــي الله عنه ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر صـــلى الله علیه وســـلم فەرموویەتی: **«الجرس مزامير الشـــيطان»** (مســـلم؛ في صـــحيحـه، برقم:[٢١١٤]). واتە: جەرەس بریتیە لە زوڕنـاکـانی شەیطان..

تەنانەت هاوشێوەی مزمارەکانی پێشـوو باسی کردووە کە ئێمە باسمان کرد جا دوای ئەم هەموو شـــتە لێتان دەپرســـین باشـــە چی ڕێگریمان لێ بکات کە دوای ئەم هەموو شـــتە عوزر بۆ ســـەید بهێنینەوە و گومانی باشــی پێ بەرین؟ بەڵکو تەنانەت بۆ هەر شـوێنێکی تەفسیری ظلال بگەڕێیتەوە دەبینیت سەید لەباسی مۆســـیقا دەربارەی قورئان زۆربەی جارەکان مەبەســـتی خۆی باســـکردووە و وتوویەتی کە مەبەســـت لەمەدا دەنگی خۆش و جوانی دەربڕین و ئەداکردنە لەڕووی و ئیعجاز و گەورەیی باســی کردووە بێ ئەوەی مەبەســتی ئامێرە لاهی و ژەنینەکان بێت پەنا بە الله، بەڵام لەترسی درێژبوونەوەی زیاتر ئەوەندە بەســەو قسـەکانی تری باس ناکەین، کەسی حەقویستیش یەك بەڵگەی بەسـە. ئەگەر لەمەدا عوزر بۆ ســـەیـد نـاهێننەوە دە کەوایە هەمـان شـــتیش جێگیر بکەن بەسـەر فەرموودەکانی پێشـودا ! یان بەڕوونی بڵێن ڕقمان لێیەتی و شـوێن هەواو ئـارەزووی خۆمـان کەوتووین و بەبێ کوفری ئـاشـــکرا تەکفیری دەکەین والله المستعان وعلیه التکلان

## پرسیاركرا لە زانای موحید وعەقیدە پاك دەربارەی سەید قوتب

ووتەی زانای پایەبەرز و عەقیدە پاك و كۆتا زانای دەعوەی نجدیە الشـــیخ ی العلامه حمود بن عقلاء الشـــعیبی. یە كە یەكیكە لە زانـا موعتەبەرەكـان و مامۆسـتای زۆربەی زانای گەورە و ناوداری تەوحید بووە لەوانە (مامۆسـتا علی بن خضـــیر . ســـلیمان العلوان ... كە ئەم زانایانە هەموویان لە زینـدانی ال سعودی وەلی ئەمری مەدخەلییەكانن) .لە سەر سید قطب ...

**پرســـیار:** جەنابی بەڕێز شـــیخ حمود بن عقلاء الشـعیبي خوا بیپارێزێت ووتە و قسەو باس زۆرە دەربارەی سید قوتب ڕەحمەتی خوای لیبێت ، ئەوەتا هەندێك پـاكی دەكەنەوە لە هەموو هەڵەیەك وە هەنـدێكی دیكە دەیكەن كەســـێك لە تاوانكار و فاجیرەكان هەتا لە كافرەكان واتە كافری دەكەن ، كامە حەق و تەواو و راستە لە نێوان ئەوانەدا !!؟؟

**وەڵام:** بەدڵنیـاییەوە ســـیـد قطب ڕەحمەتی خوای لێبێـت دووژمنی زۆرە ، وە جیاوازن لە چۆنیەتی ڕەخنەگرتن لێی وە ئامانج و مەبەســـتەكانیان جیاوازە ، وە هەموویان كۆڕا و یەك دەنگ دەبن لە بەرژەوەندییە هاوبەشـــەكانیان ، وە پێش ئەوەی بەتاڵی و نادروستی ئەو كەموكوری و تانانە ئاشكرا بكەم كە ڕووبەڕووی سید كراوەتەوە ڕەحمەتی خوای لێبێت ، ئەوە ڕوون ئەكەمەوە یەكەمجار بۆچی ســـیـد قوتـب بەتـایبەت ؟ وە كێ ســـوود مەنـدە لە ڕووخـان و خســـتنی ئەو كەســـایەتیە ؟ بە دڵنیایی ســـید ڕەحمەتی خوای لێبێت لەســـەردەمی خۆی بە یەكێك لەو زانایانە ئەژمێردرێت كە خاوەنی ڕێگە و ڕیبازی دژایەتی ســـتەمكاران و كوفر پێكردنیـانە ، وە لە تـاكە بـانگخوازەكان بوو كە خەڵكی بۆ بەنـدایەتی پەروەردگاریان بانگ دەكرد وە بانگی دەكردن بۆ یەكتاپەرستی لە حوكم بردنەوە بۆ لای شرعی الله تعالی لەبری قوانین دانراوی ئەوروپی و ئەمریكی

(توحید التحاكم ) ، جێگە و ڕێگەی هیچ كەســێ پێ تەنگ و جوڵاو نەبوو ئیلا جێگە و مەكانی دووژمنەكانی الله تعالی پاشـان پێغەمبەر صـلی الله علیه وسـلم

نەبێت وەک نمونەی جەمال عبد الناصر و هاوشیوەکانی ، ئەو ستەمکارانە بە خێرایی کوشتیان و لەناویان برد ، بەڵام کاتێک گومانیان کرد و هەستیان کرد کە ئەیکوژن ئەوکات بە خوینەکەی ڕێبازەکەی زیندوو دەبێتەوە و ووشەکانی حەماسەت دروست ئەکەن ، وە لە نێوان موسڵماناندا زیاتر قبوڵی ڕێبازەکەی دەکرێت وە نوسراوەکانی زیاتر بڵاو دەکرێتەوە ، لەبەر ئەوەی بەڵگەی هێنایەوە بە ڕاستگۆیی و جێگیری و پێداگیری لەسەر بەهێزی مەنهەجەکەی ، بۆیە جارێکی دیکە هەوڵیاندا بۆ تانە لێدانی بە مەبەستی کووشتن و مراندنی ڕێبازەکەی . بە ئامانج گرتنی سید قوتب ڕەحمەتی خوای لێبێت تەنها ئامانج خودی کەسایەتی سید قوتب نییە وە تەنها کەس نییە لە زانایان کە بەربەستیان لە ڕێگەی دروست کردووە ، سید قوتب هەندێ هەلەی هەیە ئێمە ئینکاری بوونی ئەو هەلانە ناکەین ، بەڵام تانە لێدان تەنها بۆ خستنی خودی سید خۆی نییە بەراستی ئەو خۆی بەخشی بە پەروەردگاری وە ئێمەش داوای پلەی شەهیدی بۆ دەکەین لە الله تعالی کە پێی ببەخشێت ، بەلام سید هەتا ئیستاش دوژمنەکانی و شوێنکەوتووی دووژمنەکانی ترس و بیم و دڵەو ڕاوکێیان بۆ دروست بووە لەوەی کە ڕێبازەکەی بڵاو بیتەوە لە نێوان نەوەی موسڵمانان دا . وە کاتێک من ئەبیستم کەسێک تانە لە سید دەدات ڕەحمەتی خوای لێبێت لام نامۆ نییە لەبەر فەرمایشتی الله تعالی (وكذلك جعلنا لكل نبي عدوا ) واتە: هەر بەو شێوەیە بۆ هەموو پێغەمبەرێك دوژمنێکمان داناوە لە شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە هەموو کەسێک کە ڕووناکی پێغەمبەرایەتی واتە لە زانست و ڕێنمونی ئەوی هەبێت ئەوا بە هەمان شێوە دووژمنی ئەبێت بە ئەندازەی ئەو زانستەی کە هەیەتی لە پێغەمبەرەوە علیه الصلاة والسلام واتە بە ئەندازەی شرع زانیەکەی تانەی تانەدەرەکان هیچ زیانی بە سید نەگەیاند ئیلا پێی بەرز بویەوە و چاکەکانی زیادی کرد پێی ، بەڵام ئەوەی دەبێتە هۆی سەرسوڕمان هەڵسوکەوتی ئەو کەسانەیە کە لافی پەیڕەوکردنی ڕاستی و

ڕەوایەتی لێـدەدەن بەلام لەگەڵ ئەوەش تەرازووەکە لاســەنـگ دەکەن و بە تەرازوو پێوەرێکی وورد و دادپەروەرانە کێشـــان و پێوانەی نـاکەن الله تعـالی فەرموویەتی ( ويل للمطففين الذين إذا اكتالوا على الناس يســتوفون وإذا كالوهم أووزنوهم يخسرون ) واتە هاوار بۆ تەرازوو بازان ، ئەوانەی کە پێوانە بکەن(بۆ خۆیان) لەســەر(ماڵی) خەڵک بەتەواوی وەری دەگرن ، بەڵام کاتێک بۆیان پێوانە یا کێشـــانە بکەن کەمیان دەدەنێ ، جا ئەوانو ئەگەر بیانەوێت وەســفی کەســێک بکەن کە چەندین هەڵە و زلاتی هەیە چەند جار زیاتر لە هەڵەکانی سید ئە قسـە باوەکەیان ئەکەن کە ئەڵێت :: هەڵەکانی وون بوون لە دەریای چاکەکانیدا یان ئەڵێن :: ئاو کە گەشــتە قولەتین پیســی هەڵناگرێت هەروەها جگە ئەمانە لە ووتە گەلی دیکەی هاوشــێوەیان ، وە ئەگەر بیانەوێت زەمی کەســێکیش بکەن وەک ســید ڕەحمەتی خوای لێبێت کە بە یەکێک لە نوێکەرەوەکان دادەنرێت لە بابی ( ان الحكم الا لله ) دا ، ئەوا ئەوکات ڕێگای خوارجی لەگەڵ ئەگرنە بەر بەکافر کردنی بە تاوان و زەلات . وە ئێمە بانگەشەی پـاکێتی نـاکەین لە هەڵە بەڵکوو ئەڵێین بەدڵنیـایی هەڵەی هەیە ئەوە بواری تەفســیل پێدانی نییە ، بەڵام تێکەڵت مەکە لەگەل بنەمای بانگەوازەکەی وە ڕێباز و بیروباوەڕەکەی ، هەروەک چۆن لای جگە ســید قـوتب یش لای زاناکان یش هەڵە هەیە کە نـابێتە هۆی عیبـدار بوونی پێگەیـان بە نمونەس وەک ابن حجر والنووی وابن جوزي وابن حزم ، ئەوانە هەڵەیـان هەیە لە عقیـدە کە نەبۆتە ڕێگر لەبەردە م هیچ یەکێک لە ڕۆڵەکانی ئەم ئوومەتە و وە هیچ یەکێک لە زاناکانی کە لێی سـوود مەند بن یان مافیان پێشـێل بکات و ئینکاری فەزڵیان بکات ، ئەوانە پێشــەوان تەنها لەو شــتانە نەبێت کە هەلەیان تێدا کردووە ، وە هەمان ئەو حاڵەش لەگەل سید قوتب دا ڕەحمەتی خوای لێبێت کە هەڵەکانی لە بنەما و بنچینەی بانگەواز و بیروباوەڕ و ڕێبازەکەی کەم ناکاتەوە و عیبداری ناکات کە بەنگەوازی خەلکی کردووە بۆ توحیدی حاکمیەت واتە یەکتاپەرســتی

دەســەڵاتدارێتی پەروەردگاریان ، وە بنچینەیەک کە پێویســتە جێبەجێ بکرێت لەم جۆرە حاڵەتانەدا بریتیە لەوەی سوود وەربگیرێت لە فەرمایشتی الله تعالى ( يســألونك عن الخمر والميســر قل فيهما إثم كبير ومنافع للناس و إثمهما أكبر من نفعهما ) واتە : پرســيـارت لێ دەكەن دەربارەی عەرەق و قومار بڵێ: لەم دوانەدا گوناهی گەورەو چەند قازانجێک هەیە بۆ خەڵکی بەڵام گوناهەکەیان گەورەترە لە قازانجەکەیان . ئەوەی هەموو کەســێک ئەوەی جێبەجێ دەکات لە بنەمای دینەکەی کە پیویســتە بیکات لە دوای ئەوە تەماشــای تەواوی بیروبـاوەڕ و ڕیبـازەکەی ئەکرێـت ، ئەگەر هـاتوو هەڵەکانی زۆرتر بـوو لە ڕاستەکانی وە شەڕی زاڵ بوو لەسەر سوودی بۆ خەڵکی ئەوە وازی لێدەهێنرێت و کتـابەکانی ئەپێچرێتەوە و وە نـاخوێنرێتەوە ، لەســەر ئەم قـاعیدە ووتەی جیاکەرەوە لەســەر ســید ڕەحمەتی خوای لیبیت ئەوەیە کە هەڵەکانی نادیار و داپۆشــراون لە بەرامبەر فەزڵ و بەرگری لە ( لا إلـه إلا الله ) بەتـايبەت کە بنەماکانی بیروباوەڕی ڕاســت و دروســت بووە ، وە ئەگەر چی هەندێ هەڵە و دەربڕینی هەیە ئێمە هاوڕای نین و نابین ڕەحمەتی خوای لێبێت .

لە کۆتاییدا: ناتوانم هیچ بڵێم تەنها ئەوە نەبیت وای حساب ئەکەم سید شمولی ئەو فەرموودەیە ئەکات کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی ( ســيد الشــهداء حمزة، ورجل قام عند ســلطان جائر فأمره ونهاه فقتله ) واتە گەورەی شــەهیـدان حەمـزەیە وە پیـاوێـکە کە هەلـدەســتـیـت بەڕووی دەســەڵاتدارێکی زۆردار و ســتەمکاردا ئەمری پێ ئەکات بە چاکە و ڕێگری لی ئەکات لە خراپە ئەویش ئەیکوژێت وای حسـاب ئەکەین کە سـید ئەو مەرجەی جـێـبەجـێـکـرد بەپـێـی ئەوەی کە ووتەی حەق و راســتی ووت بەرامـبەر دەســەڵاتدارێکی ســتەمکار و ئەویش کووشــتی ، ووتەیەکی دەگوازمەوە بۆتان لە پێش ئیعدام کردنی بە ماوەیەکی کەم ، کاتێک یەکیک لە زابتەکان پێی سەرسام ئەبێت بە دلخۆشی ســید ڕەحمەتی خوای لێبێت پێش ئیعدام کردنی ( شــەهید

کردنی ) سەری سوڕدەمینیت لەوەی سید نە بێزارە ونە دڵتەنگە پرسیاری لێکرد ووتی: تۆ باوەڕت وایە شــەهید ئەکرێی باشــە مانای شــەهیدی چییە لای تۆ ؟ ســید ڕەحمەتی خوای لێبێت وەڵامی دایەوە و ووتی: شــەهید ئەو کەســەیە کە شــهادەت پێش ڕۆح و خوینی ئەخات واتە دینی الله تعالی بە نرخترە لەلای لە ژیانی ، وە هەر لەبەر ئەوەیە کە رۆح و ژیانی دەبەخشێت لە پێناو دینی الله تعالی دا . وە ســید ڕەحمەتی خوای لێبێت کۆمەڵێک هەڵوێســت و ووتەی هەیە کە گومانی تیدا نییە ئەوەی حەق و ڕاستی بزانیت و بناسێت دەزانێت لە دڵێکەوە دەرچووە کە پڕ بووە لە خۆشەویستی الله تعالی و پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم ، وە خۆشەویستی فیداکاری و قوربانی دان لە پێناو دینەکەیدا داوای لە الله تعالی دەکەین کە ڕەحممان پێ بکات وە لە ئێمە و ئەویش خۆش ببێت . وصلی الله علی نبینا محمد وعلی آله وصحبه أجمعین قاله ؛ حمود بن عقلاء الشعیبي ١٤٢١/٥/١٦هـ وەرگێڕانی: تاریق احمد

كلمة حق في سيد قطب فضيلة الشيخ حمود بن عقلاء الشعيبي حفظه الله : كثرت الأقوال في سيد قطب رحمه الله ، فهذا ينـزهه من كل خطأ، وذاك يجعله في عداد الفاجرين بل الكافرين فما هو الحق في ذلك ؟ الجواب : الحمد لله رب العالمين ، والصلاة والسلام على من لا نبي بعده وبعد : فإن المفكر الأديب سيد قطب رحمه الله له أعداء كثيرون، يختلفون في كيفية النقد وأهدافه والغايات منه، ويتـفـقون في مصالح مشتركة، وقبل أن أكشف بطلان مثالب الجراحين والمطاعن الموجهة إلى سـيد رحمه الله ، أبين أولا لماذا يستهدف سـيد قطب خاصة ؟ ومن المستفيد من إسقاطه إن سيدا رحمه الله يعد في عصره علما من أعلام أصحاب منهج مقارعة الظالمين والكفر بهم ، ومن أفذاذ الدعاة إلى تعبيد الناس لربهم والدعوة إلى توحيد التحاكم إلى الله ، فلم يقض إلا مضاجع أعداء الله ورسوله كجمال عبدالناصر وأمثاله .. وما فرح أحد بقتله كما فرح أولئك، ولقد ضـاق أولئك الأذناب بهذا البطل ذرعا، فلما ظنوا أنهم قد قتلوه إذا بدمه يحيي منهجه ويشـعل كلماته حماسـا، فزاد قبوله بين المسـلمين وزاد انتشـار كتبه، لأنه دلل بصـدقه وإقدامه على قو ة منهجه، فسـعوا إلى إعادة الطعن فيه رغبة منهم لقتل منهجه أيضا وأنى لهم ذلك. فاستهداف سيد قطب رحمه الله لم يكن استهدافا مجردا لشـخصـه، فهو ليس الوحيد من العلماء الذي وجدت له العثرات، فعنده أخطاء لا ننكرها، ولكن الطعن فيه ليس لإسـقاطه هو بذاته فقد قدم إلى ربه ونسـأل الله له الشـهادة، ولكن الذي لا زال يقلق أعداءه وأتباعهم هو منهجه الذي يخشـون أن ينتشـر بين أبناء المسـلمين . وإني إذ أسـمع الطعن في سـيد قطب رحمه الله لا أسـتغرب ذلك لقوله الله تعالى: ﴿ وكذلك جعلنا لكل نبي عدوا ﴾ فكل من معه نور من النبوة أيضـا له أعداء من أهل الباطل بقدر ما معه من ميراث نبينا محمد عليه الصـلاة والسـلام ، فما يضـير سـيدا طعن الطاعنين، بل هو رفعة له وزيادة في حسـناته، ولكن الذي يثير الاسـتغراب هو فعل أولئك القوم الذين يدّعون اتباع الحق ومع ذلك

ينقصون الميزان ولا يزنون بالقسطاس المستقيم والله يقول: ﴿ ويل للمطففين الذين إذا اكتالوا على الناس يستوفون وإذا كالوهم أو وزنوهم يخسرون ﴾ ، فأولئك إذا أرادوا مدح أحد عليه من المآخذ ما يفوق سيدا بأضعاف قالوا كلمتهم المشهورة "تغمس أخطاؤه في بحر حسناته" وقالوا "إذا بلغ الماء قلتين لم يحمل الخبث" وغير ذلك، وإذا أرادوا ذم آخر كسيد رحمه الله الذي يعد مجددا في باب ( إن الحكم إلا لله ) سلكوا معه طريق الخوارج وكفروه بالمعاصي والزلات . وسيد رحمه الله لا ندعي له العصمة من الخطأ، بل نقول إن له أخطاء ليس هذا مجال تفصيلها، ولكنها لا تخل بأصل دعوته ومنهجه، كما أن عند غيره من الأخطاء التي لم تقدح في منزلتهم وعلى سبيل المثال ابن حجر والنووي وابن الجوزي وابن حزم، فهؤلاء لهم أخطاء في العقيدة إلا أن أخطاءهم لم تجعل أحدا من أبناء الأمة ولا أعلامها يمتنع من الاستفادة منهم أو يهضمهم حقهم وينكر فضائلهم ، فهم أئمة إلا فيما أخطئوا فيه، وهذا الحال مع سيد رحمه الله فأخطاؤه لم تقدح في أصل منهجه ودعوته لتوحيد الحاكمية وتعبيد الناس لربهم. والقاعدة التي يجب أن تقرر في مثل هذه الحالات هي ما يستفاد من قول الله تعالى ﴿ يسألونك عن الخمر والميسر قل فيهما إثم كبير ومنافع للناس وإثمهما أكبر من نفعهما ﴾ فكل من حقق ما يجب تحقيقه من أصل الدين، ينظر بعد ذلك في سائر منهجه فإن كان خطؤه أكثر من صوابه وشره يغلب على نفعه فإنه يهمل قوله وتطوى كتبه ولا تروى ، وعلى ذلك فالقول الفصل في سيد رحمه الله أن أخطاءه مغمورة في جانب فضائله ودفاعه عن ( لا إله إلا الله )، لا سيما أنه حقق أصول المعتقد الصحيح ، وإن كان عليه بعض المآخذ وعبارات أطلقها لا نوافقه عليها رحمه الله . وختاما : لا يسعني إلا أن أذكر أنني أحسب سيدا والله حسيبه يشمله قوله عليه الصلاة والسلام (( سيد الشهداء حمزة، ورجل قام عند سلطان جائر فأمره ونهاه فقتله )) فنحسب أن سيدا رحمه الله قد حقق ذلك الشرط حيث قال كلمة

حق عند ســـلطان جائر فقتله .. وأنقل كلمة له رحمه الله قبل إعدامه بقليل عندما أعجب أحد الضباط بفرح سيد قطب وسعادته عند سماعه نبأ الحكم عليه بالإعدام "الشــهادة" وتعجب لأنه لم يحزن ويكتئب وينهار ويحبط فســأله قائلا : أنت تعتقد أنك ستكون شهيدا فما معنى شهيد عندك؟ أجاب رحمه الله قائلا : الشـــهيد هو الذي يقدم شـــهادة من روحه ودمه أن دين الله أغلى عنده من حياته، ولذلك يبذل روحه وحياته فداء لدين الله . وله رحمه الله من المواقف والأقوال التي لا يشك عارف بالحق أنها صادرة عن قلب قد مليء بحب الله وحب رسوله صلى الله عليه وسلم، وحب التضحية لدينه، نسأل الله أن يرحمنا ويعفو عنا وإياه. وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين قاله ؛ حمود بن عقلاء الشعيبي ١٤٢١/٥/١٦هـ